


**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **زاکیرەی با**
- **نووسینی:** ئەحمەدی مەلا
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٢**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** هێڤی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٢٧)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٤٩)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێڕست

سوپاسێکی بێپایانم بۆ برای خۆشەویست کاک عەبدوڵا قادر دانساز، بۆ پێداچوونەوەی ئەم بەرهەمە.

# پێشەکی

سالّی سێیەمم بوو لە فەرەنسا کاتێک شەڕی دووەمی کەنداو دەستی پێکرد؛ یانزە سالّ بوو کەرکووکم جێهێشتبوو و لە هاوینی ١٩٩٢ بۆ یەکەمجار کە گەڕامەوە ولاّت، بە قاچاغ گەڕامەوە کەرکووک و پینج رۆژ تیای مامەوە. دوای ئەوەی گەڕامەوە فەرەنسا، چەند مانگێک بەسەر ئەو سەفەرەدا تێپەڕی، لە پۆلی سێیەمی زانکۆ بووم کاتێک دەستم بە نووسینەوە ئەم چەند لاپەڕانە کرد و پاش حەوت سالّ، لە ئیسپانیا، جارێکی دی سەر لە نوێ نووسیمەوە.

سیوداد رێیال/ئیسپانیا

٢٠٠١-٧-١٧

# پێشەکی بۆ چاپی دووەم

دوای تێپەڕینی ١٠ ساڵ بە سەر نووسینەوە ئەم دەقە، لە سەر داواکردنی چەندین هاوڕێ بۆ ئەوەی "زاکیرەی با"، سەر لەنوێ لە چاپدرێتەوە، بە باشم زانی سەر لە نوێ بیخوێنمەوە. بۆیە لە کاتی خوێندنەوەیدا، داڕشتنێکی نوێ، بە پێی پێویست خۆی دەسەپاند. هیچ گۆڕانکارییەکی بنەمایی بەسەر هەیکەلی دەقەکەدا نەهاتووە، بەڵکو لە داڕشتنی هەندێ دەستەواژە و هەندێ رستە و لە هەندێ شوێنیش بە باش دەزانرا کە پێداگرم لە سەر چەمکی گێڕانەوە. بۆیە ئامرازەکانی پەیوەست لە هەندێ شوێن گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و هەندێجاریش بۆی زیاد کراوە لە پێناوە بەستنەوە و مەحکەمکردنی پەیوەندی نێوان پەرەگرافەکان.

# سێبەرەکانی قەڵا

ڕەنگبێت ڕۆژی یەکەم بەدەربێت لە هەموو وەسفێک؛ زەحمەتیش بێت بچێتە ژێر نووکی ئەم قەڵەمەوە، چونکە ڕۆژی یەکەم لە ڕەنگی حەپەساندا شیکل وەردەگرێت. هەر لە ڕەنگی داروبەردەوە تا دەگاتە ڕەنگی دەرگا و دیوار و پەنجەرە و پەردەکانی بەردەرگا و تەڕەشوعی قەد دیوارە گەچینەکان و کاشییە بەردینەکان و کەرپووچە سوورەکان و چەمەنتۆی زبری ناو حەوشە و تەختەی شێدار و بنمیچی بەرزی بێدەنگ. گشت ئەمانە و بۆنێکی نوێ: هی ساردیی و شێ و سیبەری گوڵی پرتەقاڵی تازە شکۆفەکردوو و شەتڵە ڕێحانەی ئینجانەکان و فەزایەکی قووڵیش، بێموبالات تێی دەڕوانین. هەتاو مێوانێکی غەریبە و ناگاتە کووچە پێچاوپیچەکانی ئەو مەملەکەتە بەرزە. ڕاستە بڵندە و بەرەو هەتاو بەرزبۆتەوە، بەڵام بەرەو چ دیوێکی؟

ئەو حەپەسانە لە پنتێکدا چڕ ببوەوە. ئەویش پاراستنی قەتییەک بوو کە ڕەنگی ڕاستەقینەی دەشتاییەکانی ساڵەیی بوو: ڕەنگێکی گەرم لە پەڕو باڵ و شاپەڕ و کلکێک کە لە دووی خۆی تا دەهات وەکو کلچ، ڕەش، باریک دەبووەوە و بە ویرگوڵێک کۆتایی دەهات. قەتێ لەو باڵندە کێوییانەیە کە زۆر بە زەحمەت دەستەمۆ دەبن. بۆ وی کەویی بوون، ون بوونە. کۆتایی بەهار رووودەکەنە دەشتاییە زەردەکانی "زەردک" و پێش ئەوەی باوتۆزی خەزانیش هەڵکات، خۆیان و بێچووە هەراشەکانیان دەگەڕێنەوە بەرەو باشوور؛ سەدان بەڵکو هەزاران کیلۆمەتر بە باڵ دەبڕن.

قەتییەکەم کردبووە کارتۆنێکی کونکونی گەچراو؛ بە ئاستەم رووناکی دەگەیشتێ. مشتێک گەنمیش بۆ ئەوەی ماڵیی بکەم! ئەویش لەو باڵندە کێوییانەیە کە لە ئەزەلەوە بڕیاری ئەوەیان داوە کە لە گەڵ ڕەگەزی مرۆڤ هەڵنەکەن. ئیتر تاکو مردن مان دەگرن. دەنووک بۆ گەنمی ڕۆکراو نابەن، بە

تایبەت کاتێک خەڵکیان لێوە دیار بێت. منی وڕکن و کاڵفامیش دەمویست لە کوونێکەوە تێی بڕوانم و خۆم ئاشنای شێوەی ژیانی بکەم. بزانم چۆن دەنووک بۆ گەنمەکان دەبات، چۆن هەر بە دەنووک تاڵ تاڵ شاپەڕەکانی خاوێن دەکاتەوە، چۆنیش پێڵوەکانی دادەخات و ئەو هێڵە شینباوە گرنجگرنجە، شۆڕدەبێتەوە سەر چاوە رەشە کێوەییەکانی. کاری من ئەوە بوو، سووچێک بدۆزمەوە بۆ ئەوەی ئەو رۆحە پەروازەیەی هێور کەمەوە کە چەندین جار خۆی لە داوی شوانان دزیوەتەوە و ئەفسووس، بێئەنجام رۆژێکیان باڵی لە بەنی داوێک گیر دەبێت و پاشان بە دیاریی دەدرێتە من. سووچێکی گەورەتریش بۆ خۆم، کەمێ گەورەتر لە قەفەز، بۆ ئەوەی بە چاوە چڵێسەکانم ژیانی بلێسمەوە.

دەمزانی نافڕێت، چونکە سێ تاڵ لە شاپەڕی راست و چەپی هەڵقاچراون، باڵندە دەکاتە گیانلەبەرێکی دوو پێ. سووچەکەی ئەو لە دەستی چەپی دەرگای حەوشەبوو، ئەو دەرگا ئاسنینەی کە دەیڕوانییە کووچە باریکەکانی قەڵا. هەر لە هەمان سووچ و بە بەرزایی باڵای مرۆڤێکیش، سنووقێکی بچووک، پەنجەرەیەکی شووشەیی هەبوو کە بواری بە بینینی میلێکی سەر سوور دەدات کە بە هێواشی ژمارە رەشە بازنەییەکانی بەسەردەکردەوە، هەڵواسرابوو. هێواشی و خێرایی میلەکەش پەیوەست بوو بە خەرجکردنی وزەی کارابا. لە دڵی خۆمدا دەموت ئەم سنووقە بۆ یاریکردن خراپ نییە. ئەو سووچەم کردە ناوچەیەکی ئازاد و بۆ بەڕەڵاکردنی باڵندەکەم هەڵمبژارد. ناوچەیەکی ئازاد بۆ ئازادییەکی ناسک.

دەرگا بچووکەکەی کارتۆنەکەم کردەوە و کارتۆنەکەم لارکردەوە وگوێم لە خرچەی چڕنووکی قەتییەکە بوو کە بێئامان دەیوست لە کارتۆنە لووسەکەی گیرکات، لە گەڵ گەنمە رۆکراوەکان، بۆ سەر چەمەنتۆیە شێدارەکە، هەڵخلیسکاو کەوتە خوارەوە.

کاتێک کەوتە سەر زەوییەکە، شڵەژاو سەیری راست و چەپی خۆی دەکرد. شێ و مەیلەو ساردیی چەمەنتۆیەکەش، هەستێکی دەگمەن بوو

دەگەیشتە پێیە وردیلەکانی. یەکسەر، کێوییانە بەرە قوژبنی سووچەکە رایکرد و باڵەکانی بە نیمچەکراوەیی، دەیانویست داڵدەی بدەن. دەیویست لە گەڵ دیوارەکەدا ببێتە(ببنە) یەک. هەندێ گەنمی دیکەم رۆکرد و ویستم بچم جامێک ئاوی بۆ بهێنم؛ چاوەکانی دەرژانە بەتاڵییەک ئەو سەری دیار نەبوو. بیرم لەوە نەدەکردەوە کە باڵندەیەکی کێوی دەبێت چۆن بڕوانێتە ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی کە دووچاری بووە. رەق و هیشک، وەک باڵندەیەکی مۆمیاکراو. ئەمە کۆچێکی ناوەختە و نەک تەنها هەر سروشتی ژیانی تەسک دەکاتەوە، بەڵکو دەشیشێوێنێت. هەر لە چاوە رەشە بچووکەکانییەوە هەست بە شیرازەتیکچوون و واقوڕمانێکی کوشندە دەکرا. ئەملاو ئەولای دیوار، نیمچە ساردییەکیش پێیە ناسکەکانی ئەزیەت دەدات و ئاسمانێکیش هەر هەندەی دەسەسرێک، لە سەرەوە، قووڵ، شین دەچێتەوە. کێ دەڵێت ئەو پارچە شینایییە بۆ ئەو ئاسمان بوو! ئاسمان بۆ ئەو گەرمیی و رووناکیی و فڕینێکی بە بێ پەیوەستیش بوو. ژیان بۆ ئەو لە ناو رووناکییەوە دەستی پێدەکرد، پێش ئەوەی بێتە سەر رووی زەوی. دەمەوێت بڵێم، هەر هێشتا زەرنەقووتە بووە و لە ناو هێلکەیەکی قاوەیی رەنگ، کاڵ؛ کاتێک هەتاوی مانگی گەلاوێژ لە دەشتاییەکانی ناوچەی شوان هەڵدێت، بۆ قەدەرێک لە ناوەندی ئاسمانێکی بێسنوور، پشوویەکی درێژ دەدات و رووناکی خۆی بەرەو ناخی هەموو بەرجەستەیەک رۆدەچوێنێت؛ ئەویش، خۆی لەناو لینجاوێک گرمۆڵە داوە و چاوەکانی هێشتا نەترووکاون، بەڵام هەست بەو رووناکییە دەکات کە سەرچاوەی ژیانێتی. کاتێکیش تاریکیی شەوان چوارچێوەی سروشتی بەربەرەڵای خۆی دەقۆزێتەوە، ئەستێرە وەرد و درەشتەکانیش ئاوازێکی تریان دەخستە نێوجەرگەی سروشتەوە، ئەم ئاوازە دەبووە رووناکییەکی دیکەی سروشت، بۆ قەتێی چاونەتروکاو.

ئەی ئێستا؟ وا بە هێواشی دەست بەسەر پشتە نەرمەکەیدا دەهێنم و زۆر بە ئاسپایی بەرەو کلکە رەشەکەی شۆڕی دەکەمەوە و تەزوویەکیش خۆش، بە تەواوی داگیرم دەکات. هەوڵێک بوو بۆ دەستەمۆکردن؛ ئەمە لە کاتێکدا

دایک و باوکم خەریکی گواستنەوەی کەلوپەل و بوزگڕە کەڵەکەبووەکانی ناو حەوشەکەبوون. ئەوان، بێدەنگ، دەیانویست، دوای ئەو ماڵگواستنەوەیە، ماڵە نوێیەکە دامەزرێنن، منیش دەمویست ئاووهەوایەکی گونجاو بۆ باڵندەکەم مسۆگەر بکەم. ئەمەش لە نێو کەشێکی ماتدا رووی دەدا. بێدەنگییەک بە ئاشکرا دەهاتە زمان.

خانووەکە! وەکو ئەو کات دویانوت "قاپی باغڵەمەیە"، زاراوەیەکی نوێ: واتە کلیلی ماڵ لە چنگی کرێچییە، کەسی دیکە لەو ماڵە ناژێت. لە ژوورێکی گەورەی لاکێشەیی پێکدەهات و بەقەد دژوورەکەش، لە خوارەوە ژێرزەمینێک هەبوو. هەر لە دەرەوەش را، دوو وایەری قاوەیی ئەستوور، هەر بە دوو توولەماری درێژیان دەکرد، بە جووتە بەرە ژوورەکە خشابوون کە بە گڵۆپێکی شەستی کۆتاییان دەهات کە ژوورەکەیان رووناک دەکردەوە.

کاتێکیش تەماشای دیوارەکانم دەکرد، بە دیار ئەو ئاژەڵە ئەفسانییانەوە رادەمام کە تەروشوع و شێ لە سەر لەبغە هەڵتۆقیوەکاندا دروستیان کردبوو. دەمڕوانییە هەموو شتێک: سویچی گلۆپی رەنگ گەچین، سەعاتی کارەبا، شەش ریزە دیرەگە ئاسنینەکە کە بە هێڵی شەمەنەفەری سەربەروەژێریان کردبوو، لە بنمیچی ژوورەکەدا قایمکرابوون. نغرۆی ئەندێشە و خەونی ئەو شتە نامۆو سەرنجڕاکێشانە ببووم کاتێک دایکم ئاوڕی لێدامەوە، بوخچەیەکی گەورەی لە باوەش، بەروە ژوورە لاکێشەییەکە دەڕۆیشت و پێی وتم "*دە واز لەو تەیرە بەسزمانە بێنە و وەرە یارمەتییەکمان دە*". منیش لە دڵی خۆم دەموت، ئەی ئەمە یارمەتی نییە! وا بۆ سەعاتێک دەچێت خەریکی دروستکردنی ماڵێکی نوێم بۆ قەتییەکەم! سەیرێکی دایکمم کرد و وتم "*ئەی قەتێیەکەم چی لێبکەم؟*". "*بەرەڵای کە کوڕم*" پێی دەچوو بێ بیرکردنەوە دایکمم وەڵامم بداتەوە و ناخۆشترین وەڵامم لە شار گوێ لێبووبێت، ئەو وەڵامەی دایکم بوو و لە گوێم زرینگەی دەدایە "*بەرەڵای کە کوڕم. بەرەڵای کە کوڕم بەرەڵای کە کوڕم* ". "*بەرەڵای چی دایە، خۆ نافڕێت، باڵەکانی هەڵقاچراون!*" یەکسەر وەڵامی دایکم دایەوە.

برا گەورەکەم کە چوار پێنج ساڵ لە من گەورەتر بوو؛ ئەو لە گەڵ دایک و باوکم خەریکی ماڵگواستنەوە بوو. بێدەنگ، لە نێوان ژوورەکە و حەوشەکە، وەکو بارهەڵگر دەهات و دەچوو. هەر کە گوێی لەو گفتوگۆ کورتەی نێوان من و دایکم بوو، هات و کەمێک لە من نزیکبووەوە و هەڵوێستە یەکی کرد و سەیر قەتێیەکەی دەکردم و پاشان سەیرێکی منی کرد و وتی: "*حەز دەکەیت بیبەیتە دەرەوە؟*" پرسیار و بەتەنگهاتنەکەی ئەوەم لە رستەکانی دایکم لە لا چاکتر بوو. یەکسەر بە هەردوو دەست قەتێیەکەم هەڵگرت و خستمە باوەش و پێیم وت "*دەی با برۆین*".

ئێمەی نەشارەزا، دەرگا ئاسنینە سەوزەکەمان لە دووی خۆمان بە کراوەیی جێهێشت و وردە وردە لە ماڵ دوورکەوتینەوە. هەر لە دوورڕا دیار بوو کە دوو گوندین، یا لەو دەشتەکییانە دەکەین کە دەمێک نییە هاتبێتنە شار. هێشتا تەپوتۆزی گوند ملە سووتاوەکانی داپۆشیبووین، بە کراسی خەتخەت و پێڵاوی لاستیکەوە، چاوە رەشەکانمان رەنگی غەریبیی و خاوێنیی لێدەتکی، بەڵام تاکو بناگوێشمان ماندوو.

هەر ئەو بەیانییە زووە بوو کە لە خەوهەڵسابووین و پیکابە شینەکە لە بەردەم ماڵمان رایگرتبوو و خەڵکی ئاوایی، ئەوانیش لە خەوهەڵسابوون و بەرامبەر ماڵمان، دوو دوو، سێ سێ، بە ژن و پیاوەوە راوەستباوون. هاتبوون ماڵئاویمان لێبکەن و تەنکە غەمێکیش لە چاوی هەموویان دەخوێندرایەوە، چونکە کەسیان حەزیان نەدەکرد ئاوایی جێبهێڵین. لە سەر سیما و روخساریان ماتەمینی و لە جوولە و بزووتنەوەکانیشیان ڕارایی دیار بوو. چێشتەنگاو بوو گەیشتینە سەر پشتی قەڵا.

**ئەوا ئێستاش دەوروبەری نێوەڕۆیە. سەرەتای پاییز و سەرەتای ژیانێکی نوێش بەڕێوەیە.**

گوێمان لە هەندێ وشە بوو. لە هەمووی تێندەگەیشتین، چونکە دڵنیا نەبووین کە لە گەڵ ئێمەیانە. ئەمە بۆ یەکەمجاریش بوو منداڵی جیاواز ببینین. هەڵسوکەوتی جیاواز، لەهجەی جیاواز و لاساریی جیاواز. منداڵ

بوون، بە گەورە دەچوون. بەرەو رووی ئێمە دەهاتن و تا دەهات لێمان نزیک دەبوونەوە. ترسێک لەشمی دەهەژاند، هەستم دەکرد شتێک لە ژێر سەریانە. تووشی یەکەم ترس هاتم. نەمدەزانی قەتێیەکەیە بووەتە گێچەڵ. یەکێکیان بە بێ ئەوەی سەیرمان بکات وتی:

– ئەو قەتێیە دەفرۆشیت؟

منیش بە تۆنێکی کەمێ تورە وەڵامم دایەوە:

– قەتێ چۆن دەفرۆشرێت!

ئەوەی تریان کەمێک لێم نزیکبووەوە و بە بێ ئەوەی گوێی لە وەڵامەکەی من بووبێت:

–ئەرێ دەمدەیتێ، با سەیرێکی بکەم؟

کە ئەمەی وت، تەواو لێم نزیکبووەوە و لە پڕێکیشدا دەستی بۆ قەتێیەکە برد و لە دەستی راپسکاندم و ئەوەی دیکە کەمێ دوورکەوتبووەوە، پاشان بۆی هەڵدا. لە نێو ئەو مەسافەیە کە تەنها چەند مەترێک دەبوو، قەتێیەکە هێزی دایە خۆی و وەک بڵێی ئاگری شاپەڕی نوێ لە باڵەکانییەوە روابن و خۆی لە دەستی هەمووومان راپسکاند و فڕی. سەرەتا، بە ناوەند کۆڵانەکەوە، بە نزمی دەفڕی. هەر چوارمان، وەک ئەوەی خاوەنی راستەقینەی بین، کەوتبووینە دوای و غارمان دەدا. زۆر بەرز نەدەفڕی، بەڵام لە ئێمە تیژتر بوو. هەستیشم دەکرد ئەگەر بهاتبایە کەمێک خێراتر غارم بدابایە، رەنگبوایە بمگرتبایە. ترس و شپرزبوون وایلێکردین کە نەتوانین گوڕی تەواو بدەینە خۆمان. ترس لەوەی کە ئیتر قەتێیەکە نەگرینەوە، ترس لەو دوو بێژییە کە نەماندەزانی چۆن لەبەر لووتمان خۆیان قووت کردەوە، هەروەها ترسی ونبوونیشمان هەبوو. غارمان دەدا و هێزی زیاترمان دەدایە خۆ و قەتیشمان لێ دوور دەکەوتەوە. قورگم پڕ گریان و هاوارێکی تاساویشم دەکرد. ونبوونیش هێدی هێدی لە نێو جەستەم مانای دەدایە خۆ و خۆی دەدۆزییەوە. دوو منداڵەکەش لە نێوان خۆیان وشەیان دەگۆڕییەوە، هیچیان لێ تێنەدەگەیشتم. وشەکان کوردی بوون و بەس!

به کوچە باریکەکاندا بە دوای قەتێیەکەوە غارم دەدا و هیچی دیکەم نەدیبینی. لە پڕێکدا ئاوڕم دایەوە، کەسم لێوەدیار نەمابوو. براکەم لێ ون بوو. غارم دەدا و هەنسکێکی هیشکیش قورگی دەسووتاندم و دڵۆپە ئەسرینی قەتیسبووی چاوانیش، هەندەی دیکە هێزی غارکردنی زیاد دەکردم.

سەیرم دەکرد، وا بە ناو خڕی خاسەدا، لە بەرزاییەکی کەم دەفڕێ. شەقی ئەملاو ئەولای باڵەکەی دیاربوو. هەردوو باڵەکەی کەلۆس بوون، بەڵام دەفڕی. منیش هێزم دەدایە خۆم و غارم دەدا؛ دەتوت لە هەردوو بازوومەوە پەڕ دەڕسکێت، بایەکی فێنیکیش رووخسارم دەماڵێت و ئەو زەنگوڵە عارەقانەی کە لەسەر جەستەشم دروست دەبوون، یەکسەر دەبوونە هەڵم و لەشم فێنک دادەهات. بازووەکانم رادەوەشاند و گەرم دادەهاتن، هەستم دەکرد پێیەکانم لە زەمین نادەن. ئەم هەستە نوێیانە وای لێدەکردم بۆ چەند چرکەیەک بیر لە قەتێیەکەم نەکەمەوە. لەوە دەترسام کە بەیکجاری منیش بفڕم و نەیەمەوە سەر زەوی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا تاقە مەبەستی من ئەوە بوو قەتێیەکەم بگرمەوە و بیهێنمەوە سەر زەوی. لە نێوان ئاسمان و زەمیندا شەقاوم دەنا، هەستم دەکرد شەقاوەکانم دوو سێ مەتر زیاتر دەبوون و ئینجا بە ئاستەم پێیەکانم دەکەوتنەوە سەر زەوی. خڕی خاسە ئاوی پێدا نەدەهات، بەڵام لەملاو ئەولا ئاوی کۆبووەوەی بەهار، گۆلاوی بچووک بچووکی دروستکردبوو و گەنی بوون. هەستم دەکرد چاڵە ئاوی سەوزباون، مێش و مەگەزێکی هاوینەشیان لەسەر کۆبۆتەوە؛ بە ئاسانی بازم بەسەریاندا دەداو و لە دووی خۆم جێمدهێشتن. هەندێجاریش گۆمە ئاوەکان درێژکۆڵەبوون، هێزی زیاترم دەدایە خۆم و بە سەر ئەوانیشدا بازم دەدا. ئیتر ئەم بازە نارێکانە وەکو گەمەی لێدەهات و چاویکیشم هەر لە قەتێیەکەم بوو.

لە پڕێکدا گوێم لە دەنگەدەنگ بوو. ئاوڕێکم دایەوە، یەکێک لە منداڵەکان بوو، گەورەکەیان بوو، ئەوەی کە سەری پاک بە مووس تاشرا بوو، جوێنی شارستانی پێ دەدام. غارم دەدا و سەیریشم بەو جوێنانەدەهات. وەڵامم

نەدەدایەوە، بۆیە بەردی هەڵدەگرت و تێی دەگرتم. بەردەکان بە تەنیشتمدا قریشکەیان دەهات و دەکەوتنە سەر بەردە پەرتوبڵاوەکانی خاسە کە ئاوی زستان لە گەڵ خۆیدا هێنابوونی. تاکو بۆ بەردێکی دیکە دەنووشتایەوە، من ئەوەندەی دیکە لێی دووردەکەوتمەوە. بەڵام قەتێیەکەش لە هەردووکمان دوور دەکەوتەوە. لە تاوی غاردان تووشی هەناسەبڕکێ ببووم و توێژێ عارەقیش هەموو لەشمی دادەپۆشی. ماندوو بووم، توانای غاردانم نەما. هەوڵەکانم بێسوود بوون، هەردوو ئەژنۆم شل ببوون.

ئاوڕم دایەوە. قەڵا، دوور، بەرز، بەڵام زووش دەدۆزرێتەوە. توانای جوولەم نەمابوو، بە دیار یەکێک لە چلپاوەکانی بەردەمم دانیشتم و سەیری قەتێیەکەم دەکرد تا لە چاوان ئاوابوو. خۆی قوتار کرد و قەڵاش لە پشتەوە. سەیری چلکاوەکەم دەکرد، بلقی هەوا، جارناجارێ لە ژێر ئاوە رەشەکەوە دەردەهات و دەتەقی و بۆنێکی ناخۆش لووتی دەکرووزاندمەوە. سەیری ئەو ئاوە رەشەم دەکرد و وێنەی هەموو ئەو رۆژە و شەوی پێش سەفەرەکە داگیریی دەکردم. هەر لە شەوی پێش سەفەرەکەوە پیکابە شینەکە کە لە پێش دەرگای حەوشەمان رایگرتبوو. سەرلەبەیانی و گریانی پیرەژنانی و دوعای خێری ریش سپی و حاجیان و حیکمەتی پیرەمێردان و بۆنی باوەشە نانە گەرمەکەی میمکی دایکم "*دەهانی، تا فریای بازار دەکەون، ئەو قلە نانە بەرن*". بە تایبەت، ماچە بەهێزەکەی نەنکم و کارتۆنەکەی باوەشم، لە پشتەوەش، لە ناوپیکابەکە، بەرەو رووی گوند و پشت لە شار، دانیشتبووم و سەیری گوندم دەکرد چۆن تا دەهات بچووک دەبووەوە و لە ناو تەپوتۆزی ئەو بەیانییە بەیەکجارەکی ون بوو.

بیرم لە برا گەورەکەم کردەوە. ئاوڕێکم دایەوە، هاڵاو، چەرچەفە هاڵاو، بە درێژایی خڕەکە لە سەر گۆمە چلکاو و بەردە رێژراوەکانی خڕی خاسە کۆبووبووەوە. وێنەی براکەم لە مێشکم و هاڵاوە پەرتوبڵاوەکەش بەرامبەرم تێکەڵ یەکتر دەبوون. هەڵسامە سەر پێی و سەیری راست و چەپی خۆم کرد. کەس دیار نەبوو. لە ناوەندی خڕی خاسە هەستێکی قووڵ لەشمی

ورووژاند. هەستێک بوو وەسف نەدەکرا. بە تەنها، غەمگین، بە سستی و ماندوویی بەرەو قەڵا دەگەڕامەوە. لە ڕێی گەڕانەوە، سەیری ئەملاو ئەولامیش دەکرد بەڵکو براکەمیش بدۆزمەوە. لە دڵی خۆم دەموت *"ئایا دەبێت گەڕابێتەوە ماڵ؟" "ئایا لە گەڵ ئەو دوو شارستانییە نەیکردبێتە شەڕ؟"، "دەبێ ئێستا دایک و باوکمان چمان پێ بڵێن؟"*. ئەم ڕستە پرسیارئامیزانەم لە خۆ دەکرد. لە قەڵا نزیکبوومەوە، ئەمە یەکەمجار بوو قەڵا هەند بە هەیبەتەوە ببینم، بەرز، سەرکەش، دەتوت نهێنییەکی لە ناخ دایە، سێبەرەکەی دەکشا و هەموو خرێ خاسەی گرتبووەوە. ترس و هەیبەت بوون، ئەمجارە تێکەڵی هەنگاوەکانم دەبوون.

وردە وردە لە حەشامات نزیک دەبوومەوە. دەنگە دەنگی بەرز و هەراو زنا، غەڵبەغەڵب و دەنگی هەراشی تایبەت شار تێکەڵ بە یەکتر دەبوون. ئەم هەمووە وێنەی غوربەتییان بۆ یەکەمجار تیاما دروست دەکرد. سەیری روخسارەکانم دەکرد، سیمای ئاشنایەتییان تیا نەدەخوێندرایەوە. حەماڵ وبارهەڵگران، بە دەنگی هەراش و کەرخ، بە خێرا لە جادەکە دەپەڕینەوە. هاتوچۆکەران تێکچڕژابوونە نێو یەکتر، ئەوانیش بە بێ هیچ خۆ ئامادەکردنێک لە جادەکە دەپەڕینەوە و کەس سەیری کەسی نەدەکرد. ڕێم دەکرد و بە حەپەساوی لە ژێر سێبەری دیوارەکاندا لە پەیژەی قەڵا دەگەڕام. بە تەنیشت باخچەی هەڵواسراودا تێپەڕیم، دوو سێ چین درەختی جۆراوجۆر، لە سەر پەیژەکان چێنرابوون، لە خوارەوەش گوڵی هەمەچەشن، بە تایبەت گوڵەباغێکی زۆر بۆنێکی خۆشیان لە موحەجەرکانەوە ئاودیوی دەرەوە دەکرد. پەنجەکانم بە شیشی موحەجەرەکاندا دەهێنا و دەنگێکی تایبەت تێکەڵی عەتری باخچەکە دەبوون و لە قووڵاییەکانی خەیاڵیشم باڵندەیەک تا دەهات دوور دەکەوتەوە و ئاوازێکیش لە نێو پەنجەکانم هێوریی پێدەبەخشیم. بە دەستی لای ڕاست جووتقاوەیە و ڕێکوراستیش چاخانەی حەسیرەکانە. جووتقاوە هەر لە ناوەکەیەوە دیارە، قەرەباڵغە:

بازرگان، وردەفرۆش، عەتار و کەبابخانە و دەیان دوکانی دیکەی جۆراوجۆر...

هەستم بە ونبوون دەکرد. قورگ هیشک و هەنسکیکی قەتیسیماویش لەشمی بەرەو نادیار دەپێچیبووەوە. بیرم لەوە دەکردەوە، دەبوایە لە ماڵ دەرنەچوومایە. شتیکم ونکرد. بیرم لەو ساتە کردەوە کە بڕیارەکەی تیا درا. لە نێوان خۆزگەی دایکم و پرسیاری برا گەورەکەم دا، ئێمە دەرەوەمان هەڵبژارد.

سەیری دوکانی بازرگانانم دەکرد، تۆپە قوماشی رەنگاوڕەنگ، گڵۆپی گەورە بریقەی لێهەڵدەساندن. بە تایبەت ئەو تۆپە قوماشانەی کە سورمەی سپی زیوین و ئاڵتوونیان تیا هەڵکێشرابوو، دەتوت چروسکەی گڕیان لێوە دەردەهات. رەنگاو بوو چۆڕەی دەهات. بە ئاهەنگی رەنگ دەچوون، نارنجی و سوور و وەنەوشەییەکان لە ژێر چراکاندا لەززەتێکی نهێنی تیا دروست دەکردم. هێشتا ئاوازی رەنگەکان مێشکمیان جینەهێشتبوو، بۆنی کەبابخانەکان و دوکەڵە چڕەکان لە لوولەکانەوە بە پڕتاو دەردەچوون و بەرەو ئاسمان بڵاودەبوونەوە. دەتوت ئیمڕۆ هەموو شتێک سەرئاو کەوتووە و هەموو شتێکیش بەرز دەبێتەوە. جەستەی منیش کێشی خۆی لە دەست دەدا و بایەک هەڵیدەکرد و ئەو ئاهەنگەی لە رەنگ و بۆنوبەرامەی دەسڕییەوە. ئەو کات، بۆ منداڵێکی غەریبی وەکو من نەدەکرا پرسیاری وا لە خۆم بکەم: بۆچی باوکم گوندی جێهێشت؟

**وا بیست و هەشت ساڵ بەسەر ئەو رۆژانەدا تێپەڕی، دوای ئەو هەموو دابڕانە، سەیری هەمان دوکان و هەمان بازار دەکەم و وا هەست دەکەم گشت ئەو ماوەیە تەنها ماوەی سەرخەو شکاندنێکی کورتی عەسرانە. سەرخەوی کورتی عەسرانیش پڕی لە خەونی سەیر و سەمەرەیە. بەیانییەک بوو، پیکابێکی شین لەبەر دەرگای حەوشەمان رایگرتبوو، هەندەی نەبرد لە سەر پشتی ساردی قەڵای کەرکووک ئێمەی دانا و رۆیی. دوای بیست و**

**هەشت ساڵ، رەنگی قوماش و بۆنی دوکەڵ و هەمان بۆنوبەرامە بە بەر لووتمدا تێدەپەڕێ... هەموو شتێک وەکو خۆیەتی!**

دوای ئەوەی قەتییەکەم نەگرتووە، پێش ئەوەی تاریک دابێت گەڕامەوە ماڵ. دایکم شڵەژابوو، براکەم ماندوو، دانیشتبوو. دایکم دەستی کرد بە هەڕەشەکردن و هەندێ جوێنی مزری پێداین"کە ئیتر نابێت لە ماڵ دوورکەوینەوە". تەباغە یەکچاوەکە لە ناوەند ژوورەکە داگیرسابوو و مەنجەڵێکی فافۆنی لەسەر بوو، بۆنی چێشتی لادێی کەمێک غەریبی رەواندینەوە. هێشتاش بوزگوڕ و بوخچەکان گرێکانیان نەکرابوونەوە و بە ناو ماڵەکەدا، پەڕشوبڵاو، لێرە و لەوێ بڵاوببوونەوە.

ئێوارەی یەکەم، بە بێ بڕیار، ماتەمینێکی بۆ هێناین. دەبوایە شتێکیش هەبوایە بۆ ئەوەی ئەم ماتەمینییە بڕەوێنێتەوە. ئیتر سەرەتای ژیانێکی نوێیە. ساکارترین تاماشاکردن ئەوەی بۆ روون دەبووەوە کە ئێمە پەناهەندەی ماڵی خۆمان بووین. کەس پیلی نەگرتبووین و بە زۆرەملێ گوند بەدەرمان کات و بمانهێنێ و لە ماڵە غەریبە دامانێت. بەڵام شتەکانیش هەندە ئاشکرا بوون، پێویستی بە باسکردنیش نەدەکرد. یەکێک لە لێکدانەوەکانی باوکم، دوورکەوتنەوە لە گوند و هاتنە شار، دوورکەوتنەوەیە لە دەردو بەڵا. بەڵام هەموو دەردوبەڵاکانیش لە راستی دا لە شارەکانەوە دەهاتن و یەخەی گوندییان دەگرت!

سەرەڕای ئەوەی کە گڵۆپە شەستییەکەی کە بە ناوەند ژوورەکەدا شۆڕببووەوە و لە فانۆزەکەی گوند جوانتر ژوورەکەی رۆشن دەکردەوە، بەڵام هێمنی تیشکی فانۆزی نەبوو. هەموومان لە دەوری تەباغە یەکچاوکە گرد ببووینەوە. ئەوە جۆرە کرۆشکدانە، هەروا لە خۆڕاییەوە دروست نەدەبوو. بێدەنگ چاوەڕوانی باوکمان دەکرد. ئیتر دەرەوە بە بێ هۆ، ترسیی لە ناخماندا دەچاند. کاتێکیش باوکم دەهاتەوە، هەر لە دەرگای ماڵەوە، پێش ئەوەی بێتە ژوورەوە، چەند چرکەیەک رادەوەستا و سەیری دەکردین، ئیتر

هەموو هەستمان بە ئارامیی دەکرد. تەنها ئەو بوو ببووە سەرچاوەی هێمنی و حەوانەوەیەکی کاتیی بۆ سەرجەم خێزانەکە.

دوای ئەوەی نانمان خوارد، هەندەی نەبرد، وەکو گوندییان، هەموو لێیخەوتین:

*"دەستم ناوەتە ناو دەستی منداڵە شارستانییەکە و پێکرا غار دەدین. هەروەها براکەمیش لە دوومانەوە غار دەدات. تەمێک هەر لە سەراب دەچوو، سیمامانی شاردبووەوە. سووک وەک دەبدەبە، باش غارم دەدا، بە بێ بەربەست، بە سەر خانووەکاندا، بە سەر ستارەکاندا بازم دەدا، شەربەکانم لە سەر ستارەکان دەبینی، لە دوورەوە وەکو فانۆز داگیرسابوون، بە تەنیشت کوللە زەرد و پەمەییەکاندا بە پێی پەتی، تەنها دەزوویەکی نادیار منی بە دونیاوە گرێدابوو. غارم دەدا. منارەی مزگەوت و گومبەزی گەرماوەکان و قەڵەمتۆزە نارێکەکان و چنارە باریکەکان بە حەوایا هەڵگژابوون و ئێمەش بە کۆڵانەکانیاندا راماندەکرد. پێدەکەنیم. غارم دەدا. دەستم لە دەزووی کۆلارەکان دەداو بۆ قەدەرێک لە گەڵ خۆمدا دەیانمبردو بەرز، لە ئاسماندا بەرەڵام دەکردن. فەنەرەکان وەکو ئەستێرەی نزیک و نەوی داگیرساون و بەر بای لەشم دەکەون و دەلەرێنەوە. پرتە پرت دەکەن و هەناسەدەدەن. تەیرە عەبابیلەکان و شەمشەمەکوێرەکان بە خێرایی دێن و کەوانەیی دەزووڵەیەکی نادیار لە دووی خۆیان دروست دەکەن و ون دەبن. ئێمەش لە ناو زریقەیان ون دەبین. ناو بە ناویش کوترێکی سپی، قەڵەو وەکو پەری، تاک تاک دەفڕن و باڵەکانیان بەر تیشکی ئەستێرە نزمەکان دەکەون و دادەگیرسێن. لە دوورڕا، قەتێیەکەی خۆم دەبینمەوە، خۆی بوو، بە باڵە هەڵقاچراوەکانی ناسیمەوە. چاوڕەش، کلک باریک، پەڕە زەرد و قاوەییەکانی کە مەیلەو کەسک خۆیان دەنواند کاتێک بەر رووناکی ئەستێرە و فەنەرەکان دەکەوتن. شاگەشگە دەبووم و ئۆخژنی دونیای پێدەپەخشیم. هەر کە بینیم، دەستی شارستانەکەم بەردا و دوای کەوتم. وەک دوو ماسی لە نێو ئاوێکی شینی ئاسمانی، هەوای ئۆقیانووسمان هەڵدەمژی و ئێمەش ئازادانە بۆ ئاسۆ*

***دوورەکان دەماندایە شەققەی باڵ. دەمویست بیگرم و تا ئەبەد پێکڕا بفڕین و پێکڕا تا مەڵبەندە نائاشناکانی رووناکی بڕۆین. تا دەگەینەوە دەشتاییە سیحرئامێزەکانی وڵاتی شوان و ساڵەیی، لەوێ بۆنی پەرێزە رەنگ زێڕینەکان بکەین، خۆمان لە داوی منداڵە زۆڵەکانی ئاوایی بشارینەوە. گەرمیی ئەو دەشت و دەرە پڕ بە سینە هەڵمژین. کاتێک تینووشمان دەبێت تاکو دەم زێ نەوەستین، لەو ئاوە سازگارە بخۆێنەوە و خۆمان لە سەر لمە تەڕەکانی بگەوزێنین. ئاو لە گەرمایی مارە بکەین. کاتێکیش شەو دادێت، رووناکی ئەستێرە و مانگێکی رووسپی، بریقە لە چەو و زیخ هەڵدەستێنێت. لەوێ زیخ دەبێتە ئەستێرە و چەویش عارەقەی مانگە و کەتۆتەوە خوارەوە. سنووری نێوان زەمین و ئاسمان بۆ یەکجارەکی دەسڕێتەوە. فێنکیی شەوان سەدایەکە لە دونیایەکی دیکەوە دێت. فێنکییەکە ئاشنایەتی موتڵەق لە گەڵ مار و دووپشکە، ژیژک و بزنمژۆک، لە گەڵ مارمێلکە و قومقمۆک پەیدا دەکات و ریتمی کیسەڵێکیش میهرەبانیی دەداتە سەرجەم ئەو مۆسیقایەی کە لە دەشتودەرەوە بەرە و ئاسمانە دوورەکان بەرزدەبێتەوە. من و قەتێ دەفڕین. پێیەکانم لە دەزووی کۆلارەکان گیر دەبوون، دەستم بۆیان دەبرد و لە دەستم گیر دەبوون، دەتوت دەزووڵەی چرێشن و بە قاچوقوولمەوە دەلکێن. دەمویست ئەو دەزووڵانە لە دەست و پێم بکەمەوە و ئیتر توانای فڕینم نەدەما. وەکو گیانەوەرێک بکرێتە گوونییەیەکی نادیارەوە، هەناسەسوار دەبوو. هێزم دەدایە خۆم بۆ ئەوەی واتا بدەمەوە باڵەکانم، بێهودە، وەکو لەشێکی قورس و عارەقاوی، کەوتمە سەر دۆشەکەکەم".***

چاوم کردەوە: گلۆپێکی سفر، ژوورەکەی شین کردبوو، هەموو نوستبوون. ئەفسووس! ویستم جارێکی دی چاولێکنێم و بگەڕێمەوە نێو ئۆقیانووسی ئاسمانەکان....

دوای بیست و هەشت ساڵ، وەکو ئەوەی بچمە حەرەمی مزگەوتێکەوە، بە هێمنی، بە بازاری جووتقاوەدا تێدەپەڕیم و سەرجەم شتەکانی ئەو کاتەم تیا بووژایەوە. بە تەواوی نغرۆی ئەو کاتەبووم کە لە دوای فڕینی قەتێیەکەم، لە

ماڵ خۆمان دەگەڕام. زۆر شت وەکو خۆی مابوونەوە. سەیری دوکان و دیوار و ئەو ئەتموسفێرە سەیرەم دەقۆزتەوە و بەرەو پەیژەکانی قەلا دەڕۆیشتم. ئەو پێپلیکانەی کە بێ سێ و دوو دەیبردمە بەرامبەر قوتابخانە "ئەلمحەمەدییە". پایز بوو، لە سەر ریحلەی پۆلی دووی سەرەتایی دانیشتم. پەیوەندی دووەمم لە گەڵ دونیا دەرەوە، بەلام بە پەیوەندی یەکەمیش دەچوو. هەستم دەکرد تاقە قوتابی کورد بووم لە پۆلەکە. ئەمجارەیان ونبوونێکی تر بوو، قووڵتر و تووشی یەکەم سەدمەی کردم. سەدمە بەرامبەر بە هێمای ئاڵوگۆڕکردن. خەڕەندێکی "سروشتی" منی لە پۆل جودا دەکردەوە. رۆژی یەکەم بە تەواوی خۆی بۆ ئیعلان کردم. شەڕواڵێکی بۆری خەتخەت و کراسێکی خاکی و جووتێ پێلاوی لاستیک؛ نازانم کەێ کڕا بوون، پۆشاکی من بوون. گشت منداڵە چەتوونەکان، کە ژمارەیان کەم نەبوون، لەم پێشانگایە کۆبوونەوە. "چۆن دەبێت قوتابییەک بە شەرواڵ و جلوبەرگی کوردییەوە بێتە قوتابخانە؟" رەنگە ئەمە هۆکاری ئەو گردبوونەوە بووبێت. منیش دەستم بە گریان کرد و قوتابخانەم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ ماڵ. بڕیارمدا کە ئیتر ببڕای ببڕ نەگەڕێمەوە سەر ریحلەی قوتابخانە.

بۆ رۆژی دوایی باوکم دەچێتە لای بەڕێوەبەر و لەو کێشەیەی کۆڵیبووەوە. بەڕێوبەر بە زمانێکی ئیستیعماری وتبووی: "باڵندەیەکی غەریب بکەوێتە قەفەزێکی غەریبەوە، تا یەک دوو رۆژ شەڕە دەنووکە و پاشان هەموو بە ئاووهەوای نوێ رادێن". ئەو رۆژە، دوا رۆژ بوو کە شەڕواڵ لەبەرکەم. رۆژی دووەم بە پانتۆڵێکەوە بەرەو رووی جیهان بوومەوە؛ بەلام شتێکی ئەوتۆی لە غوربەتییەکەم نەگۆڕی.

نەک تەنها من، بەڵکو هەموو ئەندامانی خێزان دەبوایە خۆیان بۆ مەشقی ژیانێکی نوێ رابهێنن. ئەمەش کارێکە بە یەک دوو مانگ کۆتایی نەدەهات، تەنانەت پەیوەندی بە تەمەنی وەچەوە هەیە. جا هەر کەسەو لە سووچێکەوە لەم کێشە دەگات، یا لە گەلی هەڵدەکات. لەبەر ئەوەی رەچەڵەکی خێزانی ئێمە گوندیی بوو، نەک تەنها خزمی شاریمان کەم بوو، بەڵکو ئەوەشی هەبوو لە

لا چەپێکەوە دەگەیشتینێ؛ ئەمەش هەرگیز بەس نەبوو بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێکی گرینگ لەم پرۆسەیەی کە پەیوەندی بۆ خۆڕاهێنان ومەشق بە خۆکردن و خۆ بەشار راهێنان بوو. هەندەی نەبرد ئیتر ئێمە بووینە "ماڵی شار" بۆ کەسوکاری دایک و باوکم؛ هەندەشی نەبرد میمکێک و نەنکم سەریان لێداین و هاتن لە وەزع و زرووفمان تێبگەن. بە کورتی سەردانیان کردین. زۆرجار لە رێگای ئەوی دیکەوە هەندێ لە وردەواڵەکانی جیهان کەشف دەکەین کە لەوە پێشتر هەست و درکمان پێی نەکردبێت.

ئێوارانی هاوین، کاتێک دونیا فێنک دادێت، حەزێکی گەورەی خەڵکی گوندیش ئەوەیە بە ناردەوانەکاندا سەرکەون و بچنە سەربان. ئا لەوێوەوە سەیری روخساری شار کەن. رەنگبێت بۆ سەرهەڵدانی ئەم حەزە دوو هۆ هەبێت: یەکەمیان خۆ رزگارکردنە لە فەزا و بنەمای تەسکی شار و هەروەها زاڵبوونیشە بەسەر شاردا؛ چونکە گوندییەکان هەمیشە لە دوو فاقەی پەیوەندیی دان لە گەڵ خەڵکی شار. لە لایەکەوە وا هەست دەکەن هەر ئەوانن کە شار دەژێنن، لە لایەکی دیشەوە هەست بە جۆرە کەمییەک بەرامبەر بە خەڵکی شار.

هەمووومان لە ناو حەوشەکە راوەستابووین و لە گەڵ میمک و نەنکم بازنەیەکی بچووکمان پێکهێنابوو و باسی یادەوەرییەکانی گوند دەکرا. لە پڕێکدا میمکم ناردەوانەکانی بینی و نەیتوانی حەزە قووڵەکەی بشارێتەوە و بۆیە یەکسەر وتی: "*با بزانم سەربانی شار چۆنە!*" و دایە تریقەی پێکەنین. منیش یەکسەر دوای کەوتم. لە دواوە، کەوا درێژە سەوزە سورمەدارەکەی، لە پشتەوە، پێپلیکانەکانی دەماڵی و بۆنوبەرامەیەکی تایبەتیش لە گەڵیدا سەردەکەوت. هورشەی ملوانکەکانیشی تێکەڵ بە هێمنی ئەوە ئێوارە درەنگە دەبوو. کاتێک سەردەکەوت، سەیری ئەملاوئەولای دەکرد و لە حەوشەکەی هاوسێکەمان، دارپرتەقاڵەکەی بینی، گەڵاکانی کەسکێکی تێر، شێوەی ئێوارەی وەردەگرت. تا سەردەکەوتینیش، هەندێ شتی نوێی دیکەمان دەبینی. گەیشتینە سەربان، ستارەکان زۆر بەرز نەبوون، بەڵام مەحکەم

دروستکرابوون بۆ ئەوەی مەچەکی لەسەر دانێی و سەیری شار بکەیت. سەرەتا میمکم چووە ناوەند سەربانەکە و کەمێ بە نازەوە خۆی بادا، دەتوت شازادەیەکە و لە کتێبی حەکایەتەکانی هەزارە و یەک شەوەوە هاتۆتە دەرێ و لە سەر ئەم تەختەی شانۆیە زیندوو بۆتەوە. رەنگە پڕ بە دڵ، حەزیشی لەوە بکردبایە کە لە سووچێکەوە کوڕانی گوند، سەیریان بکردبایە. دەتوت هەستی ئەوەی تێدایە کە یەکێک سەیری دەکات. هاتە قەراغ ستارەکە و لە چەند چرکەکەیدا، بە چاوێکی پانۆرامایی، هەموو ئاسمانی سەربانەکانی شاری لێستەوە. پاشان سەیری دووریی دەکرد و ئێوارەش تا دەهات تاریکتر و دونیاش فێنکتر دەبوو و لەملاو ئەولاش گڵۆپ شەوقی لە حەوشە و سەربانەکان پەڕشوبڵاودەکردەوە.

منارەکەی مزگەوتی دانیال پێغەمبەر چەند سەد مەترێک لەماڵمانەوە دوور بوو، منارەکەی وەکو دارخورمایەکی بەردین بە حەوایا هەڵگژابوو. لە پڕێکدا لە مایکرفۆنەکانەوە، دەنگی ئەللاهو ئەکبەر بەرزبووەوە. میمکم سەرەتا راچەڵەکی و پاشان هەڵوێستەیەکی کرد و دایە تریقەی پێکەنین و وتی: "*خۆ دەڵێی دەنگی حوشترە!*". ئەمە یەکەمجاری بوو گوێی لە بانگی موئەزین بێت لە منارەوە پەخشبکرێتەوە. لە چاو دەنگی مەلای مزگەوتە قوڕینەکەی زەردک، وەلی دێوانە، دوو بسکی خاوکردبووەوە و دەستی دەکرد بناگوێی و بە دەنگێکی هێمن دەرژانە نیو ئەو چەند داربییەی کە لە حەوشە بچووکەکە رووا بوون. لە حەقیقەتدا، بانگی کەسی نەدەکرد بۆ نوێژکردن، چونکە هەر ئەوانەی لەوێ کۆدەبوونەوە، وردە وردە، بە هێمنی و تەسلیمبوونەوە، کڵاشەکانیان دادەکەند و دەچوونە پشت مەلاوە و نوێژیان دەکرد.

لەو حەوشەیەی کە دارپرتەقاڵەکەی لێبوو، پیرەژنێک و کچێکی جوان دەژیان. بۆنی پیاو لەو ماڵە نەدەهات. زوو ئاشنایەتیان لەگەڵ دایکم دروستکرد. بەڵکو خۆشیانیش ویست. دەمەوعەسران لە گەڵ دایکم دەچووینە ماڵیان و لە بەر سێبەرەکە، لە سەر میندەر دادەنیشتن. لە تەنیشتیشیانەوە

کوپە ئاوێک، لە ژێر کوپەکەش تەشتێکی مسین دانرابوو. دڵۆپ دڵۆپ، ئاوێکی سازگار لە سەر ریتمێکی ئاسمانیی دەکەوتە ناو تەشتە مسینەکەوە و دەنگێکی لێوەبەرزدەبووەوە هەر بە دەنگی پەرییەکی بەجێماو رێگاوبانەکانی ئاسمان دەچوو. هەندێ سەوزەش لە تەنیشت کوپەکە داندرابوو، دوو کاڵەکی نۆمانگیلەش، زەرد، لە گەڵ گەڵاکانی دارپرتەقاڵەکە بۆنوبەرامەیەکی بەتامیان ئاویتەی ئەو گفتوگۆیانە دەکرد کە لە نێوان ژنەهاوسێکە و دایکم دەکران.

نازانم باسی چییان دەکرد، بەڵام ئێستا دەتوانم مەزەنەی گشت ئەو باسوخواسانە بکەم کە ئەو ئێوارانانە دەکران. بە کورتی، باسی ئەو رابردووە نزیکانەیان دەکرد کە بەسەر هەردووکیاندا هاتبوو کە زەمەن تیایا شیکلێکی تری وەرگرتبوو. بە ئاستەم چەند رۆژێک لە سەر ساڵیک کەڵەکەی کردبوو، بەڵام هەموو تەمەنی دایکم کافی نەبوو بۆ ئەوەی هەستی خۆی لەمەڕ ئەو رۆژگارانەوە دەربڕێت. دایکم کاتێک باسی خۆی دەکرد، تەنها باسی خۆی نەدەکرد، باسی بەرجەستەکانی گوندەکەشی دەکرد، باسی ساج و تەنوور و خۆڵەمیش و کۆچ و تراکتەرە و عارەبانە و حەرەس قەومی و فەرهوود و سووتان و دەیان شتی دیکەی دەکرد. باسی مێگەلە مەڕەکەی باوکی و باسی سەپان و شوانەکان و باسی پەرێزی سووتاویشی دەکرد.

پیرەژنەکەش باسی ونیی ئەو پیاوەی دەکرد کە شوێنێکی دیاریی لەو ماڵەدا جیهێشتبوو. باسی ونیی ئەو بۆنەی دەکرد کە ئێستا بە تەواوی چۆتە قووڵاییەکانی زاکیرەی کە دەبوایە گەرموگوڕیی ئەو ماڵە مسۆگەر بکردبایە. سەرەرای ئەم دەردەسەرییەش، کیژەکەی کراسێکی سپی زۆر خاوێنی گوڵداری لەبەردا بوو، تەنها هەر بۆنی پاکوخاوێنی و بێگەردیی لێدەهات. رەنگی پێستی، سپیکەڵانە، وەک بڵێی هەرگیز بەر خۆر نەکەوتبێت. بە ناسکی دەجووڵایەوە، دەنگێکی هێمنی هەبوو و ئەگەریش زاراوەکەی دایکم بەکاربهێنم، ئەوە دەبێ بڵێم "سالارانە هەڵسوکەوتی دەکرد". دایکیشی لەو پیرەژنە رۆحانیانەوە بوو، کە نوور لە چاوانییەوە دەباری، دەنگی هەند هێمن بوو دەتوت هەرگیز نە قیرە، نە بۆڵەبۆڵ، نە هاوار و گازندە لە گەروویەوە

دەرنەچووە. ئەمەش یا جۆرێکە لە تەحەمول و ملکەچی یا جۆرێکە لە بڵندیی و شکۆمەندیی رۆحانی؟ بەڵام بە هیچ جۆرێک، لەو روخسارە بێگەردە، ئیشارەت و هێمای ملکەچی نەدەخوێندرایەوە. رەنگە بینینی سەرجەم ئەو شتانەش کاریگەریی ئەوەی لەسەر بێت کە ئەو کات من، تەمەنم تەنها حەوت ساڵ دەبوو و بە جۆرە بەرائەتێکی نەویستەوە دونیام دەخوێندەوە، بەڵام ئەوەی جێی گومان نییە، هێمنیی ئەو پیرەژنە و فێنکیی بەرسێبەرەکە و تەڕوپاروای دارپرتەقاڵەکە و کراسە گوڵدارەکەی کیژە نازدارەکە رۆحی ئەو ئێوارانانە بوون. ئەم شتانە ناکرێت گومانیان لێبکرێت.

ماڵی هاوسێیەکەمان، یەکەم ماڵی شارستان بوو کە بینیبێتم. لە هەمان کاتیشدا، زەوق و چێژی ئێمەش بە سستی تووشی گۆڕان دەهات. تا ماوەیەکی زۆر، ئێمە تەنها بە شێکلێکی فیزیکیی لە شار بووین، ئەگینا لە هەموو روویەکەوە وەکو ئەوەی لە ناوەندی گوند بژێین وابوو. ئەو ئێوارەیەی کە لەبەر سێبەرەکە دانیشیبووین، هەموو نوقمی ئەو بۆنەبەرامە بە تامە بووین کە جاربەجار بایەکی فێنک دەیهێناو دەیبرد؛ لە تیلی دەرگای ژوورەوەیان رووناکییەک کە لە سەرەوە وەکو گورزێک بە تەوژم رژابووە ژوورەکە و ئاوەدانی کردبووەوە. لە ناو جامخانەکە فەخفووری رەنگاورەنگ و پیاڵەی کەمەر باریک و قۆری ملدرێژ و ناسک کە لە سەر سینییەکی زیوین داندرابوو کە چواردەورەکەی بە جوانی نەخشرابوو، بریقەوباقیان لێ بەرز دەبووەوە. هەیوانەکە کە کۆڵەگەدارێکی ئەستوور و قایم کردبوویەوە دوو بەشەوە، بە بۆیاغێکی سپی بۆیاغ کرابوو و لە دیوی ناوەوەی ژوورەکەشەوە، پەردەی تەنک و گوڵدار شۆڕببووەوە. جامی پەنجەرەکانیش خاوێن و کە رەنگێکی سپی شەفافی هەبوو.

لە حەوشەکەش، لەسەر میندەرەکان، باس و خواس دەکرا. باسی گرێکوێرەکانی مێژوو و هەرکەسەو بە تەرحی دەردی دڵی خۆی هەڵدەڕشت. هەستم دەکرد ئەوان، بەرز لەبەر سێبەرەکانی قەڵا و زاکیرەکانی ئێمەش خۆرەتاوەکانی دەشتەکانی ئاو دەدا و لە نێو بوزگور و بوخچە و جلوبەرگ

کە هێشتا بۆنی قەنفڵ و نەعنا و مێخەکی سنووقەکانی زەردکی لێوەدەهات، دەژیاین. منیش لەو کاتەوە خولیای ئەوە بووم لە تیلی دەرگاکانەوە، فزوولیانە سەیری هەموو شتێک بکەم. نەمدەزانی دوای چەندین دەیەی دیکە دەیانووسمەوە، بەڵام بە بێویست کەرەسە سەرەتایی و خامەکانیم کۆدەکردەوە.

حەزم دەکەم رۆ بچمە نێو شتە شاراوەکان.

یەکەم کەس بووم کە کەشفی ژێرزەمینەکانم کرد. ئەو رۆژەم بە چاکی دێتەوە یاد کە بە هێواشی و بە حەپەساوی بە قاڵدرمەکاندا دەچوومە خوارێ. رۆشناییەکی سروشتی زۆر کەم، قاڵدرمەکان و بەشێکی ژێرزەمینەکەی رۆشن دەکردەوە. سویچێک و گڵۆپێکی سووتاو کە توێژی غەباری لەسەربوو، دەمیکیش بوو ئیشی رووناکبوونەوەی نەدەبینی، هەڵواسرابوو. ئەم شتە بێکەڵکانەی خوارەوەش زۆر سەرنجیان راکێشام: گڵۆپێکی سووتاو، کەرتە قەرەوێلەیەکی تێکشکاو، سۆندەیەک، دوو سێ قووتی شیری نەستەلە، کتێبی دڕاو و تۆزلێنیشتوو، پەیدەرێکی پاسکیل، کارتۆن و مەقەبا، کۆمەڵێ خەڵوز، پارچە پەڕۆ و سیپاڵ کە رەنگەکانیان لە یەک جودا نەدەکرانەوە. لەسەر هەمووشییەوە توێژێ غوبار و هێلانە و تەونی جاڵجاڵۆکە، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر رایەڵی خۆیان رستبوو، هەموو ئەم شتانەی بە بێ جیاوازی داپۆشیبوو. کەس نەیدەزای کەی ئەم ژێرزەمینە خاوێن کرابێتەوە! نەشمدەزانی سوودی ئەو ژێرزەمینە چییە، بۆیە خولیای بووم. چەند بێکەڵک دەهاتە پێشچاو، هەندەش سەرنجڕاکێش بوون بۆم. دەتوت چوومەتە ناوسکی ماڵی خۆمانەوە. هەستم دەکرد دەبێت ئا لە شوێنی وابێت، نهێنی گەورەی حەشاردابێت. دەمویست ئەو شتە بێزمان و بێکەڵکانە بهێنمە زمان و باسی مێژووی خۆیان بکەن و بەسەرهاتی خۆیانم بۆ بگێڕنەوە و مانا بدەنە وجوودی خۆیان. هەستم دەکرد دەچمە قووڵایی شاری کەرکووکەوە. کەوتوومەتە دووی ئەم شتە پووچانەی کە لە راستیشدا هیچییان وەڵامیان نە دەربارەی ئێستا پێبوو، نە دەربارەی ئایندەش.

رابردووش وەکو باڵندەیەکی مردارەوە بوو ملی لارکردبووەوە. راستیشە ئەم شتانە چەندین زانیاریی نوێت دەربارەی جیهانی نویٚ پێشکەش دەکەن، بەڵام ئەم زانیارییانە جێی وەڵام ناگرنەوە. هەستیشم دەکرد کە ئەم شتە بێکەڵک و مردووانە، لەوێندەریٚ تەنها لە توانای ئەوەدا بوون کە بەرگریی لە مەرگی خۆیان بکەن.

بەڵام ئەم پەیوەندییە دەلالاتی خۆی هەبوو، ئەم هۆگرییە شتێکی دەربارەی ئایندە هەڵگرتبوو، بەڵام نەمدازانی چییە. هەروەها ئەمە یەکەمین پەیوەندی زیندووی من بێت لە گەڵ شاردا، لە گەڵ هەناوی شاردا. ئیتر شار گەورە دەبوو و هەرئەویش واتا شاراوەکانی گوندی بۆ شرۆڤە دەکردم. تا ئەو ساتەوەختەی کە لە کەرکووک دەژیام، سەرم دەکردە هەموو ژێرزەمینەکاندا. ئیتر ژێرزەمین بووە جیهانێکی فراوان و پەنهان، ئاسۆیەکی دیم بەدی دەکرد. ئەمە ئەتوارێکی سەیر بوو، ئایا تەعبیری لە خۆگرمۆڵەکردن نەدەکرد، ئایا چوونەخوارەوە نەبوو بۆ ناخە شاراوەکان؟ رۆژ هەبوو چەندین سەعات لەو ژێرزەمینانە دەژیام، بە تایبەت پاش نیوەڕوان کە دەرەوە هەند گەرم دادەهات، قیری سەر جادەکان وەکو تۆقڵەی رەش هەڵدەتۆقین و بە گۆنای خواری جادەکاندا، بە تورپییەوە شۆڕ دەبوونەوە. زۆربەی ئەو پاش نیوەڕۆیانە لە ژێر زەمینەکاندا، بە تەنها دەژیام.

هەندەش باسی گرینگیی و خۆشیی ژێرزەمینەکەم بۆ دایک و باوکم کردبوو، رۆژێک قەناعەتم پێیان هێنا کە بێن سەرێک لە ژێرزەمینەکەم بدەن. وامدەزانی گرنیگیی و بەهای ئەو شوێنە بەڵگەنەویستە! لە سەرووی دەرگاکە، بە درێژایی نیو مەتر چینکۆیەکیان بە دیوارەکەوە قایمکردبوو و ناردەوانەکانی لە پرشکی باران دەپاراست؛ قەراغەکانی تیژبوون و منی منداڵ بە راکردن دەچوومە خوارەوە. ئەو رۆژەی دایک و باوکم دوام کەوتن، باوکم دیققەتی ئەو چینکۆیەی نەدا و بەر تەوێڵی کەوت و کەمێک وروشاندنی، بەڵام دەسبەرداری موغارەکەی من نەبوون و دەستێکی بە

ناوچەوانیدا و دەستێکی بە دیوارەکەوە تا هەردووک هاتنە خوارەوە. سەیری دیوارەکانیان دەکرد کە رەسم و پۆستەری سینەمام پێوە هەڵوسیبوون. لە راستیدا، ریکلامی سینەماکانی عەلەمێن و ئەتلەس و حەمرا و سەلاحەدین و هەندێکیش کە تایبەت بوون بە فلیمی هیندی هی سینەما خەیام بوو کە لە خوار قەڵاوە و دەیڕوانییە خڕی خاسە. ناوی سەیر و سەمەرە بۆ فەرهەنگی دایک و باوکم! ئەم شتانە هیچیان بە دایک وباوکم نەوت. دونیای منداڵان بوو و هیچی تر!

ئیتر من و شار بەیەکەوە گەورە دەبووین و پرسیاری نوێی لێدەکردم. وردە وردە، هێڵێکی سەوز، پاشان سوورم لە نێوان خۆم و خێزانەکەم کێشا. شتە بچووکەکان لە ژێرزەمینەوە دەستیان پێدەکرد و کۆتاییان نەدەهات. ئاووهەوای ژێرزەمین گونجاو بوو بۆ بۆ رامان و وردبوونەوە، وردبوونەوە لە شتە هورد و درشتەکان. جایەکی گونجاو: هاوینی فێنک و زستانی گەرم. هەندێجاریش بە شەوان، هەر لەوێ دەژیام؛ مۆمێکم دادەگیرساند و دادەنیشتم. هەر لەوێش ئامێرێکی سادەی سینەمام ئافراند کە بە سیحری ئاوێنە و هێزی هەتاو ئیشی دەکرد. ناو هەناوە گڵۆپێکی سووتاوم دەردەهێنا و پڕم لە ئاو دەکرد و دەبووە میکرۆسکۆب و لە ناوە کارتۆنێکی چوارلاکێشەییم دادەنا و لایەکم بە بەتاڵی جێدەهێشت و لایەکی دیش بە ئەندازەی فلیمێک بە مووس دەبڕی. بەکرەی فلیمی بچووکی لە سەرەوە دادەنا و بە ناوەندی کارتۆنەکە شۆڕم دەکردەوە و بە بە تاڵیی ئەو شوێنە تێمدەپڕاند کە بە قەد گەورەیی فلیمێک بڕی بووم و لە سەربانیشەوە ئاوێنەیەکم بەرامبەر بە هەتاو دادەنا و ئاراستەی ژێرزەمینەکەم دەکرد، لە ژێرزەمینەکەش ئاوێنەکەی دیکەم بە لاری دادەنا و تیشکەکەم ئاراستەی ئەو بەتاڵییە لاکێشەییە دەکرد و بە تەوژمی تیشکەکە بە نێو گڵۆپە پڕ ئاوەکەدا تێدەپڕی و دەکەوتە سەر شاشەیەکی بچووک، کە پارچە قوماشێکی سپی هەڵواسراو بوو. بەم شێوەیە فلیمەکە سەدجار لە خۆی گەورەتر دەبووەوە و کاتێکیش بە ئاسپایی، بەڵام لە سەر ریتمێکی تایبەت، شریتی فلیمەکەم بەرەو

خوارەوە رادەکێشا ئیتر ئیمکانی جوولانەوەی وێنەکانی هەبوو. ئا ئەمە شاگەشکەی دەکردم، بەڵام دەنگی نەبوو! بۆیە رادیۆیە ترانزستۆرەکەم لە پشتی شاشەکەوە دادەنا و گۆرانی جیاواز کە هیچ پەیوەندی بە فلیمەکەی منەوە نەبوو، بەرز دەبووەوە. لە بێدەنگی باشتر بوو! ئەم وێنە جوولاوانە خەونەکانی گەورە دەکردم و ئامێرەکەم لەوە زیاتر گەشەی نەکرد؛ بەڵام خەونی گەورەم ئەوەبوو ئامێرێکی سینەما بکڕم کە لە یەکێک لە کۆگاکانی شەقامی ئەتلەس بۆ فرۆشتن دانرابوو، نرخەکەی ٣ دیناری لەسەر نووسرابوو. سێ دینار بدرێتە ئامێریکی سینەما و بێتە ماڵی کوڕە مەلایەکەوە، گەورەترین گوناه بوو بۆ ئەو سەردەمە. جگە لەوەی پەیدا کردنی ئەو بڕە پارەیە خەونێکی دیکە بوو. یەک دوو جار منداڵانی گەڕەکم کۆکردەوە بۆ ئەوەی ئەم خەونانەم لەگەڵ دابەش بکەن، بەڵام هەر منداڵەو بە خەونی خۆییەوە خەریک بوو. ئەمە لە کۆتاییدا تەنها جیهانی من بوو و بەس!

وای پێویست دەکرد کە بچمە ژێرزەمینەکان بۆ ئەوەی لە شار بگەم! خێزانەکەم لەم خۆراهێنانەی من نەدەگەیشتن، ئەوان شێوەی خۆیانیان هەبوو بۆ خۆ راهێنان و خۆ گەنجاندن، تەنانەت ئەوان پلان و پرۆگرامیان لەو بارەیەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی عادات و کات و هاموشۆی دەرودراوسێ گۆڕانکاریی لە جۆری ژیانی ئێمەش رووی دەدا. زۆرجار بیر لە موهاجیرە رۆژهەڵاتییەکان دەکەمەوە کە لە لادێیەکەوە، لە پڕێکدا خۆیان لە پاریس یا لە مارسەی، یا لە میونخ دەدۆزنەوە. لە دوورەوە ئەوانەی دوێنێ و پێرێ گەیشتوونەتە ئەم شارانە دیارن. بە فۆتەی رەنگاورەنگ و دیژداشەی درێژەوە لە گەڕەکانی باربێس وەکو لە بابل وێدی جەزائر پیاسە بکەن وایە.

ئاووهەوای کەرکووک لە هی زەردک زۆرجیاوازتر بوو. زۆریش جیاواز بوو. کاتێکیش باس لە ئاووهەوا دەکەین مەبەستمان زۆر شتە. هەر لە جلوبەرگ هەڵبژاردنەوە بۆ چوونە شایی و سەیران، هەر لە جادەپەڕینەوە بۆ چوونە سەرقەبران و مەناسەباتی جیاواز، هەر لە بازارکردن و مامەڵەکردن

و نرخاندنی شت تا سەرجەم ئەو بەها مەعنەوییانەی کە جیاوازیان لە گەڵ ئەوانەی گونددا هەبوو. دوو دونیا بوون بۆ بەراوردکردن.

خۆگونجاندنی من جیاواز بوو. ئەمە خۆ شاردنەوەیە لەو ناوچە تاریک و خاکییە، رەنگە لە بەر ئەوە بووبێت مەسافە و ماوەیەک لە نێوان خۆم و شاردا بکێشم. هەر ئەم مەسافەیە وامان لێدەکات کە ئادگار و سیمای شار بخوێنینەوە. هەر ئەمەش وا دەکات پەیوەندییەکی حەمیمی، هەر بەلایەن کەم جیاواز لە گەڵ شاردا دروست بکەم. وەک ئەوەی سەرەداوی تەلیسم و لوغزەکانی شار لە ژێرزەمیندا پێکەوە بەستراونەتەوە و دەبێت بە دیارییانەوە دانیشم تا لێیان تێبگەم. لە کۆتاییدا ئەم خەونی منداڵیکی شەرمن بوو کە نوقمی ئامۆژگاریی کرابوو لەبارەی پاک و خاوێنییەوە، لە بارەوە چاک و خراپەوە، لە بارەی پەیوەندی نێو ئاسمانەکان و خاکەوە بوو. گانگۆڵەی منداڵێک بوو کە خەریک بوو درکی بە شتەکان دەکرد.

دواجار ژێرزەمین هێلکەیەک بوو تروکا!

**ئێستاش دوای بیست و هەشت ساڵ وا بەسەر ناردەوانەکاندا سەردەکەوم و بەرەو ماڵ دەگەڕێمەوە. لە خوارەوە سەیری سەرەوە دەکەم، لە خوارەوە تێیدەڕوانم. سەیری دیوارەکان دەکەم، هەر وەکو جاران لە هەندێ شوێن تەڕەشوع ئاوساندوێتی، شێ، رەنگی گەچەکەی بە تۆنی جیاواز دابەشکردووە. لە هەندێ جێگا، گەچەکە خوساوە و بەردە قاوەیی و سپییەکان دەرکەوتوون. بەردە رەقەکانی شاری کەرکووک. لە هەندێ شوێنی دیکەش، منداڵان هێڵی تێکشکاویان کێشاوە، بە تەباشیر و بەرد و خەڵۆز و پارچە کەرپووچی دەمتیژ، وێنە و روخساری تەواو نەبوو دەبینین، هەندێ پیت بە حەجمی جیاواز، وێنەی خانوویەک و ژمارەی یەک و سفر و دوو هێڵی هاوتەریب و دارخورمایەک و تۆپەڵە رەشاییەک لە لایەک، دوو تۆپەڵە قاوەییش لە لایەکی دی. تابلۆی تەجریدین بە حەجمی واقیعی. لە سەرووتریش، پەنجەرە و دەلاقە خواروخێچەکان کە لە قەراغەکانیا گورزە**

**گیای کێویلە شۆڕبوونەتەوە و هەندێ تەڕایی تا دێت باریک دەبێتەوە و ون دەبێت.**

بایەکی گەرم، گڕەیە، لە دەشتاییەکانی باشوور و ڕۆژئاواوە ڕەخسارە غەریبەکەی دەماڵێم. لە دوورەوەش گوێم لە هاژە ئەزەلییەکەی شارە. سەردەکەوتم و سامێک لە ناو چاوم لە خەو هەڵدەستێت. کەس دیار نەبوو. هەنگاو دەنێم و شوێن پێیەکانم لە سەر توێژە تەپوتۆزەکاندا ختم دەبن کە هەموو کووچە و کۆڵانەکانیان داپۆشیبوو و ژێر پێڵاوەکانم مۆریان دەکرد. دەتوت لەم کووچانە دواجەنگ هەڵگیرساوە و بە گۆڕەپانێکی جەنگیان دەکرد؛ جەنگێکی دۆڕاو، کپیی و خامۆشیی قەبرسانەکانی هەبوو. لەشکرشکاو، لێرە و لەوێ گالیسکەی پێچکە ترازاو، بە نارێکی کەتوون. لوولەی تۆپ، نیوەی تایەکەکانی نغرۆی خاکبوون و لوولەکەشی دەم بەرەو ژوور، تفی لە ئاسمان دەکرد. پەڕۆ و پیتاڵێکی زۆر و کیسە نایلۆن و کاغەزی زەرد هەڵگەڕاویش بە شپرزەیی لە دڕک و داڵ گیربووبوون کە گەردەلوولێکی گێژ و وێژ لە گەڵ خۆی هێنابوونی. کەرتە دیوار بە لایە هاتوو، نیوەی کەوتوو، نیوەکەی دیش بووەتەوە گەرد وخۆڵ. دەرگایەک لە چوارچێوەی خۆی هەڵتەکاو. کەرتە پەردەیەک، لە بەر بای گڕە دوا سروودی ماتەمینی خۆی دەچڕێت. داربییەک، باریک، وەختە لە ناوقەد ببێتە دوو کەرتەوە، بە لاریی بەرەوە ئاسمان بەرز بۆتەوە؛ لقێکی لێشکاوە و بەڵام نەکەوتۆتە سەر زەوی، گڕە دەیهێنێت و دەیبا. بۆنی سوێ دێت. هەمان بۆنی شەوەکانی "قەشقەوخوڕخوڕ" کە حەرس قەومییەکان ئاگریان لە تەڕ و هیشک بەردابوو. لە هەندێ لاوە دوکەڵێکی شین، وەکو لۆکە، شی دەبووەوە و تێکەڵ بە بێدەنگیی ئاسمان دەبوو. لە سەرەوە بە سەر ئاسمانی قەڵادا پەرشوبڵاودەبووەوە. ئاسمان شایەدێکی راستەقینە، بەڵام دەمێکە زمانی لە گۆچووە! ڕەنگی هەڵبزرکاو وەکو منداڵێکی ترساو دەڕوانێتە خوارەوە.

ئاوڕی دواوەم دەدا، بیست و هەشت ساڵم دەبینی کە منی لەو شوێنە جودا دەکردەوە. بەڵام پەیژەکان هەر پەیژەکانی جارانن، دەروازە کەوانییە

گەورەکە و تێپەڕگەکە کە هەست بە فێنکیی لێ دەکرا، ئەویش زەمەن بە سەر ئەستۆیدا تێپەڕیوە، بەڵام دانەتەپیوە بە یەکجاری. تاک و ترووک خەڵکیشی پێدا تێدەپەڕن: زەمبیل بە دەستێ، جەمەدانی لە سەرێ، کەشیدە زەردێ، دوو منداڵی سەرتاشراوی کەمێ حەپەساو بەرامبەرم دێن. خەیاڵم بۆ دوو منداڵەکەی پێش بیست و هەشت ساڵ رادەکێشێت، هەر بەوان دەچوون. وەکو ئەوەی ئەو دوو منداڵە بن و گەورەنەبووبێتن. پیرەژنێک، چرچولۆچ هێلانەی لە دەور چاوی دروست کردبوو، فۆتەیەکی سپی وەکو چۆڕێ شێر لە سەربوو، نێوچەوانیشی پرسیاری ئاراستەی هەموو کەسێک دەکرد کە بینیبایە. پرسیارێکی بێ وەڵام وەکو چەندین پرسیاری دی. پیرەمێردێکی گۆپاڵ لە دەست، ئاودیوی تاقە تاریکەکە بوو. یەکێکی دی، لە ناو تاریکاییەکەوە لە دایکدەبوو وهێدی هێدی رۆشنایی پەیدای کرد و بە تەنیشتمدا تێدەپەڕێت. سەردەکەوم و لە نێوان ئێستا-رابردوو دام.

قەدەرێ بەرز بوومەوە تا چاوم بە خڕی خاسەکەوت. هاڵاوێکی گەرم بە درێژایی خڕەکە قەوارەی بە گەرمیی دەدا و گەرمیی بەرجەستە دەبوو. ئێستاش چاڵە ئاوە کۆنەکان، ئاوی چەندین ساڵە گیای کێوی، ئەستوور، رەنگ تێر لە لێوارەکانییانەوە رواون. دەڵێی روەکی و گیاونەوەرن. هەزارەها، ملیۆنەها بەردی گەورە و بچووک، دەتوت لە لەهەییەکانی نووحەوە کەوتوونەتە خوارێ، وەکو دۆشەکی ئەجندان خڕەکەیان داپۆشیبوو. مێش و مەگەزی زۆر گززەیان دێت. یەکسەر گەرمیی وەبیر دەهێننەوە. لە هەندێ لاوە سەگی بەرەڵا بەربوونەتە کەلاکی ئاژەڵێکی کێوی.

ئا لەوێ بوو، دووچاری حەپەسانە گەورەکەم هاتم. لە نێو گشت ئەو پاشاگەردانییە، جۆرە دەستی ئەندازیارێک بەدی دەکرێت. ئەمە بێت رەنگە مانای "فەوزای جوان"بێت کە لە دایکبووی رێککەوتە؟

ئا لەم شوێنە بوو چارەنووسی من دیاریی کرا، لە گوێی ئەم چڵکاوانە. ئیتر ئەم شوێنانەن کە رابردووم لە لا بەنرخ دەکەن، ئەم فەزا و ناڕێکییە، ئەم عەودالبوون و پاشاگەردانییە لە لای من واتادارن.

لە روویەکەوە ئاوڕدانەوەیەکە بەرەو رابردوو، بەڵام لە راستی جۆرە ئاوڕدانەوەیەکە کە باوەش بۆ ئەبەدییەت دەکاتەوە. ئەبەدییەت! ئەویش دەیان پرسیاری هەڵگرتووە، چییە سەرچاوەکەی، ئەو ئاوەی کە ئەم چەمکەی لێوە هەڵدەقوولێت؟ خۆ ئەویش زۆر روون و سازگار نییە. ئا ئەمەیە سەرچاوەی سەرجەم رارایییەکان؟ ئاخر لەم سەرچاوەیەوە جۆگەلەیەک بەرەو زەریاکانی عەدەم رێڕەوە خۆی دەدۆزێتەوە.

رۆژی یەکەم رۆژی حەپەسانە نەک پرسیار. کاتێکیش درەنگتر هەراش دەبێت و دەبێتە پرسیار، یا شیکلی پرسیار وەردەگرێت، لە هیچ زەمینێک وەڵامێکی چنگ ناکەوێت، وەڵامێک بێت ئەو هاڵاوە گەرمەی کە لە ناخمەوە سەرچاوە وەردەگرێت فێنک کاتەوە. بەڵام هێزێکی شاراوەی دامیَ، ئەویش ئەو هەوڵ و تەقەللایانەیە بۆ ئەوەی سەر لەنویَ سەرجەم پارچەکانی زاکیرە کۆ بکەمەوە و رەخسارە شێواوەکەی جاران دروستکەمەوە. هەوڵدانێکە بۆ دروستکردنەوەی ئەو دونیایەی کە رۆژیَ لە رۆژان روخایە سەریەک و خاپوور بوو. بەڵام ئایا ئەوەی روخێنرا وەکو جاران دروستدەبێتەوە؟ ئەمەش پرسیارێکی دییە، کە لە ژێرەوە سەرجەم پرۆژەکانم هەڵدەتەکێنێت!

دوای ئەوەی کۆڵانە پێچاوپێچەکانم بڕی، گەیشتمە بەر دەرگا سەوزە ئاسنینەکەی جاران. سەرەتا ناولەپم خستە سەر دەرگاکە، وەک پزیشکیَ چۆن ناولەپ بخاتە سەر دڵی نەخۆشێک، بۆ ئەوەی بزانیَ تەندروستی چۆنە. دەرگاکە گەرم نەبوو، بەڵکو داخ ببوو. بە ئاستەم پاڵم پێوەی نا، بە لای دەستی راست کرایەوە. چاوە چڵێسەکانم ئاراستە ئەو قوژبنە کرد کە کاتی خۆی کارتۆن و قەتێیەکەم لێی دانابوون: دوو جیقنەی زەردی سەوزباو هیشکەوەببوون. سەرم هەڵبڕی و سەیری دەرگای ژوورەکەم کرد، غەڵبەغەڵبی رۆژی یەکەم لە ناو مێشکم وەکو شارەمێروولە ورووژا. ماتەمینییەک و غەمگینییەک لە رێی بیلبیلەکانمەوە ئاودیوی رۆحم بوون. هەستم بەوە دەکرد کە رۆحم وەکو مەتریالێک خەریکی جموجۆڵە، وەکو غەمگینی خۆی خەریکە هیشک دەبێتەوە.

چۆڵ و هۆڵ. بێدەنگ کشامەوە. دەرگاکەم لە دووی خۆم داخست و بەرەو قوتابخانەی "ئەلموحەمەدییە" هەنگاوم دەنا. رۆژی یەکەمی قوتابخانەو قیژە و هاواری منداڵە شارستانییەکان: قژ

شانەکراو، دەموچاو سپی، پاکوخاوێن، پانتۆڵی کورتیان لە پێ. هەر کە زەنگی پشووی نێو دەرسەکان لێدەدرایەوە، ئیتر فرتەو هەڵبەز و هەراوزەنا هەموو حەوشەکەی داگیر دەکرد. هەندێکیشان بە کۆمەڵ بەرامبەر بە حانووتی قوتابخانەکە رادەوەستان بۆ ئەوەی رەحەتە لوقم و کونجی بکڕن. رەحەتە لوقمێک لە نێو دوو کونجی شیرێنی و تاڵییەک خۆیان لەیەکتر مارە دەکرد و لەززەتی منداڵانی ئەو کات بوو. هەندێجاریش وردە زیخێ ئاهەنگەکەی بۆ ماوەیەکی کورت تێکدەدات.

حەوشی قوتابخانەکە گەورە بوو، یاری شەبەکەی و سەبەتەی لێدەکرا. هێڵی سەوز و سوور سنوورەکانی دەستنیشان دەکرد. لە پێش قوتابخانە لە کاتی پشوو دا، دوو قوتابی، وەکو ئینزیبات لەملاو ئەولای دەرگاکە وەکو چاودێر دەوستان. ئەم شتانە هەموو تازە بوون بە نیسبەت منەوە. ئەگەریش لە گەڵ قوتابخانەی "زەردک" بەراورد بکرابایە، هەموو شتێک جیاواز بوو.

لەوێ دیوار و دەرگا نەبوو. لە ژووری پۆڵەوە قەرسیلەکانی دەشتیساڵەیی دەبینران. زەنگ نەبوو. هەموو بە شەرواڵەوە، پەرپووت، پۆڵەکانمان قەڵەباڵغ دەکرد. ئاسۆمان هەر لە پۆڵەوە لێدیار بوو، زۆرجاران، وەرزی بەهار، حاجی لەقلەق لە تەنیشت قوتابخانەکەمان دەنیشتنەوە. گوڵە زەردەمان لێوە دیاربوو. زستانانیش، وەک سەرتوێ، پەردە تەنکێکی ئاوی گۆماوەکان دەبوونە شەختە. پارچەیەکمان لێدەکردەوە و سەیری سروشتی لێڵمان دەکرد، وردە وردە شەختەکە دەتوایەوە، هەندەی دیکە سروشت پاراوتر دەبوو. دەشتی پانوبەرین جێی پشووی نێوان دەرسەکان بوو. نە دیوار، نە دەرگا، نە چاودێر قوتابخانەیان نەکردبووە زیندان!

کاتێک شەڕواڵەکەم دەبێتە جێی سەرسوڕمانی قوتابیان، دەست بە گریان دەکەم؛ دوو چاودێرەکەش ناتوانن رێم لێگرن و یاخیبوونەکەم هێورکەنەوە.

هەستم دەکرد لە قوتابخانە سروشت حەپسکراوە. لە ڕێگا بووم بەرەوماڵەوە، فرمێسک وەکو کەرتە شەختە دونیای لە پێشچاوم لێڵ دەکرد. کێوییانە خۆم لە قوژبنی ژوورەکەمان گیرکرد و یاخیبووم؛ ویستم جارێکی دی پێ نەنێمەوە بە قوتابخانەدا. لەو ڕۆژەوە قوتابخانە و زیندان بوونە یەک شت. خوشکەکەم دەیویست ژیرم کاتەوە، بەڵام بێسوود، فرمێسکم لە ناخەوە هەڵدەڕشت و بە چمکی چاکەتە خەتخەتەکەم دەمسڕییەوە. گریانێک بوو هەموو لەشمی دەهەژاند، خۆم وەکو روەکێکی کێوی دەهاتە پێشچاو، گەڵاژاکاو، قەدسیس و پەژموردە، پەڕەکان تەڕاییان تیانەمابوو و لارببوونەوە. ئەفسووس! هیچ ئاوێک جارێکی دی، هیچ ئینجانەیەک گوڵی کێوی لە ژاکان ناپارێزێت. لە قوژبنی ژوورەکەماندا دەگریام و گریان ناخی دەهەژاندم و رەگەکانیشم کەوتبوونە بەر بایەکی گەرمی هاجەوە.

لە راستیدا ئەمە نە مەسەلەی شەرواڵ بوو، نە وەکو بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش لای باوکم درکاندبوی "چیرۆکی باڵندەیەکی غەریب بوو"، نە حەکایەتێکی ئاسایش بوو، وەک گواستنەوەی منداڵێک لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە. لە راستیدا، ئەمە چیرۆکی هەژان و رەگهەڵکێشان بوو. ئەگەر ئینسانیش نەبوومایە، زۆر ئاساییانە، وەکو لاسکێکی گیای کێوی ملم لار دەکردەوە و پاراویی خۆمم لە دەست دەدا.

ئا لێرەوە رەگی یاخیبوونی من سەرچاوە وەردەگرێت. پۆڵ ببووە زیندان و مامۆستاش بە دەرگاوان. من و قوتابخانە بووینە دوو دوژمنی گەورە و لەو سەردەمەوە شەڕی ساردی نێوانمان هەڵگیرسا. لە پۆڵ تا دوا تخووبی دەمارگرژی، بێدەنگ. لە زمانیان تێنەدەگەیشتم وبۆیە رەشمەی خەیاڵم بەرەڵا دەکرد. رەنگبێت تێنەگەیشتن فاکتەرێکی گەورە بێت بۆ نەشونما پێکردنی خەیاڵ. غەریبیێک و غوربەتییەک تیاما چەکەرەی دەکرد. بە پلەی یەکەم بەرامبەر بە زمان، هی ئەو تورکمانانەی کە لە نەوەکانی ئۆغزنن، لەودیو دەریای ئاراڵەوە کۆچیان بۆ ئەو ئەم دەڤەرە کردبوو. میللەتان بێچووی کۆچ و شەرەکانن. ئەوان هەر لە سەدەی یانزەمەوە، ئەو هۆز و خێڵە رەوەندانە

بەرەو باشوور رۆژئاوا دەکشێن، هەندێکیان لە ئازەربایجان و هەندێکیشیان دەگەنە ناوچەکانی ئێمە.

نازنم لە چ وانەیەک بوو دەبوایە هەر قوتابیەو حەکایەتێک بگێڕێتەوە، ئەو رۆژەی کە نۆرە گەیشتە من، هیچم نەگێڕایەوە، چونکە زمانی قۆپی داغم نەدەزانی. پێی دەچوو هەموو لە سەر یەک شت رێککەوتبێتن، ئەویش ئەوە بوو کە سرە بگاتە من و چیرۆکی خۆم نەگێڕمەوە و لە کۆتاییشدا هیچ شتیک فێر نەبم. ئەم مەسەلەیە بووە مەسەلەی راهاتن. راهاتن کە کوشندەترین نەخۆشییە!

راستە فرمێسکی رۆژی یەکەمی قوتابخانە هیشکبووەوە، بەڵام لە ناو رۆحی هەژاومدا گڕکانێکی دروستکردبوو، دەریاچەیەک قورقوشمی تواوەبوو و قوڵتی دەدا. پێش ئەو گریانە، نایەتەوە یادم کە هیچ گریانێکی وام بە حەسرەتەوە بووبێت، بەڵکو گریانی پێش ئەو گریانەم هەر نایەنەوە یاد. گریانێک بوو رەگەکەی لە هەرێمە شاراوەکانی دەروونەوە سەرچاوەی وەردەگرت؛ واتە لە کێشوەرەکانی دۆزەخەوە زەنگوڵە فرمێسک دروست دەکەن. فرمێسکن ئەگەر گوڵیش بگرن، ئەوە گوڵی گڕ و کڵبەو ژیلەموون. ئەو زەنگوڵە رۆندکە سووتاوانە سنووری نێوان سروشتیی و ژیانی دەسکرد دەسنیشان دەکەن. پرسیار و پاشاگەردانیی دوو دەستەخوشکن. کەواتە تا دونیا ماوە، رەگەکان زیاتر رۆ دەچنە ناخەکانی دەروون و تا دونیاش ماوە زیاتر گوڵی گڕ دەگرن.

کەواتە با ئێمە تەنها رووی دەرەوەی ئەم بەسەرهاتانە بگێڕینەوە، لە راستیشدا ئەمە چیرۆکێکی لەبارچووە و دەبوایە کاتی خۆی بهاتایەدا زمان.

راستە یاخیبوونەکەم یەکجارەکی نەبوو؛ چونکە گەڕامەوە سەر ریحلەی قوتابخانە. ئەمەش یەکەم موساوەمە بوو کە لە گەڵ کۆمەڵ ئەنجامم دابێت. کۆمەڵ ئەو کات لە چوارچێوەی قوتابخانە و خێزاندا چوارچێوەی وەردەگرت. بەڵام ئەو قەناعەتەشم لە لا دروست بوو کە ئازادی راستەقینە لەو دیو شوراکانی قوتابخانەوە دەسپێدەکەن و کۆتایی نایەت. شتێکم لە

دەستدا، دەمویست شتیکی دیم لە جیاتی چنگ کەوێت. بۆیە زۆرجار سەیری ئاسمانەکانم دەکرد و بیرم لەو دوو فریشتەیە دەکردەوە کە باوکم دەیوت لە سەر شانەکانماندان و لە کاتی نەهامەتی فریای داماوان دەکەون. کاتێک لە پۆڵ هەستم بە ناعەدالەتییەک بکردبایە و سەیرێکی سەر شانەکانم دەکرد و هاتنیان دوا دەکەوت. بیری ئەوەم لە لای خۆ گل دەدایەوە کە رەنگبێت ئەم بەسزامانانە خەریکی ناعەدالەتی گەورەتر بن. تا گەورەتر دەبووم وەزیفەکانی ئەوان تووشی پرووکانەوە دەهاتن.

رۆژی یەکەمی من لەو رۆژەوە دەسپێدەکات، بۆیە لە گەڵ رۆژی یەکەمدا یەک شتن. یەکەمیان دووەمیان دروست دەکات. ساڵ و نیوێک بەسەر رۆژی یەکەمی یەکەم تیپەڕیبوو. بۆ من بە "کارەساتە گەورەکە" نێوزەدی دەکەم. رۆژی یەکەم وەرزی بەهار بوو، گیای دەشتودەر کەسک و ئاسمانیش تا بڵێی قووڵ و شین، بەڵام ئەو رۆژانە دەبنە لاپەرەی رۆژە تاریکەکان و لەپەڕەی لێخنن لە رۆژگارەکانی رۆژنامەکە.

"کارەساتە گەورەکە" حەرەس قەومییەکانن کە وەک کولەی برسی، وەک لەشکری جەنگیزخان، روخسار تاریک و هەنیە گرژ، قەدباریک و چاوبرسی، عەبالەشان وەک بێچووی رەشەبا. لە لایەکەوە رەشمەی ئاسمانیان بەدەستەوە بوو، زەمینیشیان لە ژێر پێ دەکرۆشت. بێدەنگیی گوندیان شلەقاند. نەنکم چووە سەربان، دەستی کردبووە کەپری سەرتەوێڵ و سەیری دووری دەکرد، سەیری باشووری دەکرد، سەیری جادەی دەکرد. جادە قیرتاوەکەی نیوان کەرکووک و هەولێر.

– قافڵەی عەسکەرە و ئەوە لە جادەش لایان داوە.

تەپورۆزێکی چڕ قافڵەکەی ئاخنییەوە.

خەڵکی گوند شڵەژان. هەندێک بە بێ هۆ هەڵاتن. هەندێک پەشۆکاو دەهاتن و دەچوون، راڕا بەرامبەر بە دەسەڵاتی لەشکر. بووە مەشورەت کردن. منیش دەستم لە ناو دەستی باوکم بوو، ئارامترین شوێن لە گەردوون. بڕیاردا: " *مێردمنداڵ و زەلام با هەڵێن و گوند بەجێبهێڵن. ژن و*

*پیرەمێرد و منداڵ با بمێننەوە*" باوکمیش بە حسێب زمانحاڵی ئاسمانە بە باش زانرا لە گەڵ خەڵک بمینێتەوە. بە لێکدانەوەی هەموو، لەشکر پیاوی ئاینی ناگرن. ئەوان بە دوای نێچیری خۆیاندا دەگەڕێن. مەلا ناکەوێتە بەر ئەو لێشاوەی کە رشانەوەیەکی رەشی ئەو رۆژە بوو.

هەندەی نەبرد کات وەستا. سەربازێکی زۆر رژانە گوند. جێب، دەبابە، زەرێپۆش. دەچوونە ماڵەکانەوە و نەمدەزانی لە چی دەگەڕێن. خەڵکی ئاوایی، ئەوانەی کە مابوونەوە هەموو کۆمەڵ کۆمەڵ گرد ببوونەوە. رەنگ پەڕیو، بە چرپە، پیرەمێردەکان لە گەڵ یەکتر قسەیان دەکرد. لە تەنیش دەرگای حەوشەکەمان جێبێکی سەربازی رایگرت. ئێمەش هەموو لە دەرەوە بووین. سەربازەکان سەیری خەڵکیان دەکرد و لە نێوان خۆیاندا بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. دوو سەربازی ئەسمەر، یەکێکیان خاڵێکی لە سەر رورمەتی هەبوو، بەرەو لای ئێمە هاتن. سەرەتا وامزانی دەیانەوێت لە گەڵ باوکم قسەبکەن. هەردووکیان بەرامبەر بە ئێمە نزیکی یەک مەتر راوەستان. بێدەنگییەک. گوێمان لە جرووکەجرووکی چۆلەکەکانی گوێسوانەکان دەبوو. خەڵکەکە کشومات. باوکم کەڵەگەت و منیش لە تەنیشتی و دەستم نوقمی ناو دەستی کردووە. یەکێک لە سەربازەکان دەستێکی بۆ کەمەری برد و جووتێک کەلەپچەی لێکردەوە و خستیانە مەچەکی باوکم. بەرەو جێبەکە بردیان و منیش ویستم لە گەڵی سواری جێبەکە بم. لە راستیدا نەندەزانی چ روو دەدات. کاتێک لە جێبەکە نزیکبوومەوە، یەکێک لە سەربازەکان هاواری کرد و منیش گەڕامەوە لای دایکم. باوکمیان سوار جێبەکە کرد و ئێمەش بێدەسەڵات سەیرمان دەکرد و مەکینەکەیان خستەگەڕ. خۆڵێکی زۆر باری، "زەردک" کفنێکی بۆری کردە بەر و بێدەنگییەکی درێژخایەن پەنگی خواردەوە.

هەندەی نەبرد، خۆمان لەناو عارەبانەی ترەکتەرێک بینییەوە و منیش نازانم بۆ کوێ دەچین. بەڵام بەرەو گوندەکانی باکووری زەردک دەڕۆیشتین. گوندمان جێدەهێشت و هاوین بە مست لە دەرگاکانی دەدا. وا بزانم ئەو

کاتەی ئێمە لە ناو عارەبانەکە هەڵتەکە هەڵتەکمان بوو، کەس لە گوند نەمابووەوە. سەیرترین شت کەس بەرگریی نەدەکرد، چونکە تەنها پیرەژن و پیرەمێرد و ژنان و منداڵان مابوونەوە. لە راستیشدا خەڵکی گوند ئاشتیخواز بوون، وا بزانم لە یەک دوو تفەنگی ئینگلیزی زیاتر کە شوانان، شەوان لە گەڵ خۆیانیان دەبرد بۆ رەواندنەوەی گورگ، ئەگینا چەکی دیکەم نەبینیبوو. یەکێک لەو تفەنگە درێژانە لە ماڵی باپیرەم بوو، بەڵام زۆر بە دەگمەن دەبینرا.

ترەکتەر دەڕوا و ئیتر بۆ یەکەمجار گوندە داڵدەدەرەکانمان بینی. کاولەسوار و کارێز و بیلالک و داو گوندیش تولکی بوو. ئەو گوندانەم وەکو خەون دێنەوە یاد. ناوەکانیان رۆچوونەتە نێو شادەمارەکانی خوێنمەوە. هەندێجار گوێم لەو دەنگانە دەبێت کە هەرگیز گوێم لێیان نەبوو، هەندێجار دیمەنێک دەبینم بیری ئەو شوێنانە دەکەم کە نەمبینیوون. هەست دەکەم دوا گوندەکانی کەون بوون، ئیتر لە دوای ئەو چەند ئەستێرەیەوە ئیتر سنوورەکانی گەردوون دەبینرێن. تاریکاییەکی ئەستوور وەک شۆراکانی دۆزەخ.

عەسرانێک، باش دیتەوە یادم لەبەر هەیوانەکە لە گەڵ منداڵیکی دیکە یاریمان بە کەرتە موقناتیس دەکرد. چ سیحرێکی هەیە ئەو پارچە ئاسنانەی ئاسنی دیکە رادەکێشن.

پێشتر خەبەر گەیاندرابووە یەکێک لە مامەکانم لە گوندی "گەڕەشێخان" مەعەلیم بوو، بۆ ئەوەی کەسێک بنێرێت و بمانباتە لای خۆیان.

عەسر بوو، خۆر بەرەو ئاوابوون غلدەبووەوە. مام ئەحمەد هات، پەیامبەرەکەی مامم.

بۆ ئێوارەکەی تولکیمان جیهێشت. شەوی درەنگ بە تەنیشت گوندە سووتاوەکاندا دەڕۆیشتین. حەرەس قەومی گەیشتبووە ئەو ناوچانەو و گورزی خۆیان وەشاندبوو. هەر ئەو شەوەش لە زێ پەڕینەوە. قەشقە و خوڕخوڕ بۆنی سۆی لێوەدەهات، بۆنی کرووزان. لە دوورەوەش گوێمان لە

حەپەی سەگی ئاوارەبوو، گوندەکان کەسی تیانەمابوو. کارەساتە گەورەکە هەموو کەونی گرتبووەوە. بە تەنیشت گوندی سووتاودا تێدەپەڕین و من و خوشکەکەم لە سەر گوێدرێژەکە بووین کە مام ئەحمەد پەیدای کردبوو. دایکم لە لای ڕاستی گوێدرێژ و تیرۆکێکی بەدەستەوە، ئاداتی شەڕ و ئاشتی، هەر جارێک بیزانیبایە خەو دەمباتەوە، نووکە تیرۆکێکی لێ دەدام، بۆ ئەوەی لەسەر گوێدرێژ بەرنەبمەوە. مام ئەحمەدیش بە لای چەپی گوێدرێژەکەوە شوولێکی بەدەستەوە بوو قسەی خۆشی بۆ دەکردم تا خەو نەمباتەوە. ئاسمانیش ڕەش دەچووەوە، پێی دەچوو ئەو شەوە هەموو ئەستێرەکان کەوتبێتنە خوارەوە. ئەسپێکی خاڵخاڵیش دوو مامی هاوتەمەنی خۆمی لەسەر بوو. ئەوانی دی، دوو مامی دیکە و برا گەورەکەم کە تەمەنیان دە و یانزە ساڵ دەبوو، بە پێ، لە پیشەوە دەڕۆیشتن.

بەیانی زۆر زوو، هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو گەیشتینە گەڕەشێخان. ئیتر هاوین و پایزێک و زستانێک لەو گوندەماینەوە. شەوانی ئەو گوندە، شەوانی گریان و چاوەڕوانییە، شەوانی تەنهایی ژێر ئەستێرەکانە. شەوانی بێدەنگیی و سکاڵاکردنە، شەوانی دوعاو پاڕانەوە و نزاکردنە. شەوانی سپییە بۆ لالانەوە. ئێواران پێش خەوتن، هەموو لە دەور بەردێکی سپی کۆ دەبووینەوە. بەردی سپی هەندە دەستی لێدرابوو، وەکو سەدەف لووس و وەکو فسفۆریش بریقەی دەهات. دەیانوت لە دەشتەکانی حیجازەوە هێنرابوو. کەسیش نەیدەزانی چۆن ئەو بەردە گەیشتبووە دەستی ئێمە. کێ ناڵێت لە یەکێک لە کەنداڵ و کەندڕە زۆرەکانی گەرەشێخان نەدۆزرابێتەوە. هەرجارەو بەر یەکێک دەکەوت و ماچ دەکرا و دەیاننایە سەر سینە. هەموو دوعاکانیش بە یەک ڕچەدا بەرەو ئاسمانەکان بەرز دەبوونەوە: "*خودایە بۆ هیمەتی ئەم بەردە باوکمان لە حەپس دەرکەیت*." بەردە سپی پارێزەری خێزانێکی ئاوارە بێدەنگ و بێزمان لە بەر دەسلێدان گەرم دادەهات.

مامێکم دەیوت: "*خودایە ئەو باوکمت بۆ لای خۆت برد، دە براگەورەکەمان بۆ بگەڕێنەوە*".

بەردی تایین، لووس و مەیلەو خڕ نەدەهاتە زمان، بەڵام هەندەی گوێی لە ناڵە و تکای ئێمە بوو، ڕەنگە ئەویش ئارەزوو لە ناخییەوە چەکەرەی کردبێت و حەزی کردبێت لە گەڵ ئێمە بکەوێتە دوعاو پاڕانەوە، بۆ کردەگاری بەرد و بەشەر" هەندە ئەو بەردەمان خۆشویست ببووە یەکێک لە ئەندامانی خیزانی ئاوارە، ببووە ریش سپی خێزان. ئارامی قەستیلەی دەداینێ. دەتوت ڕۆحی پێغەمبەرێکی شەهیدە. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دەست هۆزە کەللە ڕەقەکەی یاخی دەبێت و لە داخا دەبێتە بەرد. بەردێکی ڕۆحلەبەر بوو. دەتوت لەو بەردە سپییانەیە کە فریشتەکان لەسەر نهۆمە بەرزەکانی ئاسمانەوە دەیگرنە ئەو شەیتانانەی کە بە هەزار فێڵ و فەرتە خۆیان گەیاندۆتە دوا نهۆمی عەرشی یەزدان و هەندەیان نەماوە گوێیان لە نهێنییەکانی کردەگار بێت. ئەم بەردانە لە بەهەشتەکان خڕ کراونەتەوە و هاوێژراونە ئەجندە فێلبازەکان کە سواری ملی یەکتر بوونە و ویستویانە ئابڕووی گەردوون بەرن. مەلائیکە بەردیان تێدەگرن؛ بەرد فڕکە دەکەن و دەکەونە خوارێ. دەکەونە نێو کەندڕەکانی گەڕەشێخان. ڕاستە بەردە سپییەکەی ئێمە بە بەردە سپییەکانی دی نەدەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا، ئەویش تا دوا تخووبی گێژبوون بێدەنگ و تا خوداش حەز بکات بێدەسەڵات!

بۆ ماوەی نۆ مانگ، هەموو شەوێک چاوەڕوان بووین. شەو چاوەڕێی ڕۆژ و ڕۆژیش چاوەڕێی شەومان دەکرد. وەرز تێدەپەڕی و کاتیش بە سستی هەنگاو دەنێت. سەرەتای پایزبوو خۆم لە گەڵ چەند منداڵێکی دیکە بینیەوە کە لەبەر دەرگای قوتابخانەکە ڕاوەستابووین. یەک لە دوای یەک دەچووینە ژوورەوە بۆ ئەوەی ناوی خۆمان بنووسین. کە نۆرە گەیشتە من، چوومە ژوورەوە و خۆم نانووسکرد. سەرەتا پۆلی یەکەم تەنها شەش قوتابی بووین، هەندەی نەبرد من و "مامە" ناوێک ماینەوە. هەردووک زۆر زیرەک بووین و هەردووک یەکەممان هێنا. دوای چەندین ساڵی دیکە، "مامە"م لە هەولێر، بەرامبەر بە نادی موعەلەمین بینییەوە گوڵەبەڕۆژەی

دەفرۆشت. ئەو منی نەدەناسییەوە. زاکیرەی ئەو ساڵانە لە لای من، هەموو وردەکارییەکانی تۆمار کردبوو. رەنگە سەفەر زاکیرە چالاک و وریا بکات!

لە پۆلی یەکەم فێرە نووسین بووم. هەر لەوێ یەکەم نامەم بۆ باوکم نووسی کە لە حەپسی موسییەب بوو. دوو دێڕ و بەس بۆ ئەوەی پێی بڵێن کورەکەت گەورە بووەو چۆتە بەرخوێندن. ئەو کات، وەکو دایکم درەنگتر دەیگێڕایەوە، لەسەر هەموو شتێک دەمنووسی، لەسەر بەرد و کاغەز، لەسەر تەختە و تەنەکە، دەمنووسی و دەمنووسی.

بەهاری ساڵی ئاییندە، من لە پۆڵ بووم و گوێم لەوە بوو کە باوکم لە زیندان بەربووە. هەر بە غاردان پۆڵم جێهێشت و بەرەو دەرەوە چووم. بە بێ ئەوەی ئیزن لە مامۆستا وەرگرم بەرەوڕووی ئەو غارم دا. لێی نزیکبوومەوە، جوببەیەکی شینی تێری لەبەربوو و یەک دوو تاڵ ریشی سپی ببوو. یەکەم شت بوو سەرنجی راکێشام. لە ناو ئەو هەموو تاڵە رەشانە، سەرنجی ئەو دوو تاڵە سپییەم دەدا.

ئەو رۆژە وەکو دوارۆژی گوندی گەڕەشێخان دێتەوە یادم. نازانم چەند رۆژ و چەند حەفتەی دیکە لەو گوندە ماینەوە. لەو ماوەیەک زاکیرە خەوی لێدەکەوێت. باوکم بڕیاری خۆی دابوو. دەگەڕێنەوە بۆ زەردک، بەڵام نەک بە تەمای مانەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی بە یەکجارەکی گوند جێبهێڵین و بچینە کەرکووک. شار ئەو کات بۆ من هیچی نەدەگەیاند.

هەندەی نەبرد، شینە پیکاب لەبەر دەرگای ماڵ ئامادە بوو. ماڵی دوای کۆچ و هەڵاتن و ئاوارەبوون لە یەک دوو بوخچە گرد دەبووەوە. ئیتر سەفەر بۆ ئێمە بووە گەمەیەک، بۆ من سەفەر لە مانەوە زۆر ئاسانتری لێهات. دوای نیشتەجێبوونم لە جێیەک، سەرەتا بیر لە بەجێهێشتنی دەکەم.

شەوی پێش سەفەرمان بۆ کەرکووک، شەوێکی پڕ غەڵبەغەڵب دێتە بەر پەردەی زاکیرەم. شەوەکە زوو تێپەڕی. هەندێک باسی شار کرا، خەیاڵمی بزرواند.

کاتێکیش پیکابەکە کەوتە ڕێ، هەموو خەڵکی گوندەکە لەبەر دەرگای ئێمە کۆببوونەوە. مەکینەکەی کەوتە گڕەگڕ و ئەوانیش دەستیان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە. تاقە هیوای سەرزەوی! زۆربەیان دەگریان و هەندێکیان بە تەواوی چاوی سوور هەڵگەڕابوو. ریش سپییەکان هەستیان دەکرد پێغەمبەرەکەیان وازیان لێدەهێنێت. رەنگبێ هەستیان بە گوناه کردبێت. بەڵام دەبێت چ گوناهێکیان کردبێت! خەڵکی گوند باوکمیان زۆر خۆشدەویست، هەر شتێک رووی بدابایە ئەوە دەهاتنە لای ئەو. رۆژی یەکەمی یەکەم، ئەوەی لە گوند مابووبووەوە هاتبووە بەر دەرگای حەوشەکەی ئێمە و زۆریشان لە ناو حەوشەکە راوەستابوون. بڕوای تەواوی ئەوان ئەوەبوو کە ئەم رشانە رەشە بە باوکم دەفع دەدرێت. باوکم دەمڕاستی ئاسمان دەتوانێت شتێک بکات. بە قسەی ئەوان شەیتان شەرمی لێدەکات. بەڵام نەیاندەزانی ئەم کارەساتە نەک بە باوکم چارەسەر ناکرێت بەلکو دەیان کارەساتی دیکەشی لە پاشەوەیە. نەک ئەمەو بەس، بەڵکو دەمڕاستی ئاسمان دەگرن و سواری جێبیکی سەربازی دەکەن و حەواڵەی حەپسخانەکانی باشووریشی دەکەن. لەوەش زیاتر یەکێک لە سەربازەکان هەموو کتێبەکانی باوکمی لە کتێبخانەکەی دەرهێنا و لە ناو حەوشەکە کەڵەکەی کرد و قورئانەکەشی لەسەرووی سەرەوە دانا. ویستیان ئاگر لەو کتێبانە بەردەن کە بە زمانی ئەوان و بەشێکی گرینگی کولتووری ئەوان بوو، پێش ئەوەی ببێتە هێ ئێمە.

کە پیکابە شینەکە گوندی جێهێشت، من لە دواوە، رووم لە گوندو کارتۆنەکەم لە باوەش و لە ناو کارتۆنەکەش قەتێیەکی دەشتاییەکانی زەردکم پێیە. لە دوورەوەش جەنگەڵێک تەپۆتۆز بەرەو کەشکەڵانی ئاسمان بەرز دەبێتەوە...

ئەوەی دوای چەندین ساڵ دەگەڕێمەوە کەرکووک، بەرامبەر بە مزگەوتەکەی دانیال پێغەمبەر راوەستاوم، سەرم بەرزدەکەمەوە و سەیری منارەکەی دەکەم و گوێم لە پێکەنینەکانی میمکم خەجیجە کە چۆن دایە تریقە کاتێک بۆ یەکەمینجار گوێی لە بانگ بێت لە مایکرۆفۆنەکەوە بەرزدەبێتەوە.

هەردوو چاوە رەشەکانیم دێنەوە یاد چۆن بەرامبەر بە گڵۆپەکانی ئێوارەی کەرکووک، دەدرەوشانەوە. لە سەربانی ماڵی ئێمەوە سەیری ئاسمانی کەرکووکی دەکرد و بە نازێکی ژنانەش خۆی لە ناوەند سەربان با دەدا و حەزیکی تایبەتی کچانەش لە ناخی چەکەرەی دەکرد. بەرائەتێکی منداڵانەی سەرسوڕێنەر کە ئێستا شوێنەوار و ئاساوەراکانی نەماوە، رۆحە ساوێلکەکەی دەخستە نەشئەوە و پێدەکەنی و رووناکی چراکانی دەقۆزتەوە. خەناوەکەکەی ملی شۆڕ ببووەوە سەر سوخمە مۆرەکەی و دامێنی کەوا سەوزەکەشی لە سەر چەمنتۆیەکە دەخشی و وەکو بڵێی پزیسکی دەهاوێشت و تێکەڵی بۆنی مێخەکێکی کەسکوونی گوندیانە دەبوو. جووتێک گوارەی زیوین و دوو مورووی شینی تیا ختم کرابوون، لووتەوانەیەکیش چرووسکەی دەهات. کاتێکیش بازووەکانیشی با دەدا و وەکو سەوڵ دەیکردنەوە، هەردوو دەستە گەورەکانی دەبینران، دەستی ژنانی لادێ، دەستی ئیشکەر، بەڵام زۆر جوان لە گەڵ لەشولاری دەگونجا. هارمۆنی خۆیانیانی دۆزیبووەوە.

چونکە ژنانی لادێ، دڵنیان لەوەی کە جوانن، بە تایبەت بەرامبەر بە ژنانی شار، هەندەی دیکە خۆیانیان لە لا جوانتر دەبێت، ئەمەش پەیوەندی بە سایکلۆژییەتی ژنانەوە هەیە. دەبینین هەندێجار چۆن ژنانی لادێ توانج دەگرنە ژنانی شار. چۆن خۆی لە لای جوان نەبێت، دەبینێت سورمەی کەوا سەوزەکەی لە بەر چرا چۆن دەچرووسکێتەوە، جارناجارێکیش بۆنی سابوونێکی خۆشی لێوە دێت.

کاتێک بیر لە چاوە کلرێژەکانی میمکم دەکەمەوە، هەموو شەوانی ئەنگوستەچاوی دەشتاییەکانی بیبانی و یارمجە و پیرەئەسفهان و قادرزەمەم دیتە یاد. لە ناو چاوە بوێرەکانیەوە جار ناجارێ بریقەیەک دەردەچوو وەک تریفەی مانگ، لە بریقەی رۆح دەچوو. سەیری شەوانی شاری دەکرد و لە نەخشەی ئاسمان و ئەستێرەکان ورد دەبووەوە. هەرچەندە ئەستێرەی گوند لە هی شاران گەورەتر و رۆشنترن، بەڵام هەمان نەخشە لە ئاسمان ساز

دەدەن. دەیوت: *"ئەرێ وەڵلا ئەوە حەوتەوانەکەیە، کاکێشان ئەمەتەو ئەو دووانە ئەولاش، لەیل و ومجروومن، ساڵی جارێک دەگەنە یەک و ئیتر تا ساڵی ئایندە لە یەکتر دادەبڕێن. ئەوەی لە ئاسۆش گەش دەچێتەوە، گەلاوێژە"* گەش گەش تێپەربوونی وەرزەکان دیاری دەکات. دڵی خۆش دەبوو و هەمان نەخشەی ئاسمان ئاسۆدەیی گوندی پێدەبەخشییەوە.

لە سەرەوە منارەکە دەبینم چۆن بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە و سەیری خوارەوەش دەکەم هەمان سیانەکەی جاران، بە نارێکی، بە پێش دەرگاکاندا تێدەپەڕێت. هەمان چڵکاوەکەی جاران. ناولەپم بۆ قەد دیوارەکە درێژ کرد و ناولەپم نایە قەد دیوارەکە ساردییەک لەشمی تەنی. تەوێڵم نایە قەدی و هەردوو چاوەکانم چوقاند.

بە پەیژەکاندا دەچوومە خوارێ، جارێکی دیش بازاری جووتقاوەیە. ریزە دوکانیان تەنیشت یەک، نوقمی غەڵبەغەڵب و واژەواژ بووم و تەنکە غوبارێکیش دوکان و بازاری داپۆشیوە. لە دوکانی عەتارەکانەوە بۆنی بەهارات و کاری و بیبەر و رۆژهەڵات دەهات. لە لایەکی دیشم کڵاو و فەرەنجی و لباد و قاپ و قاچاغ، شەنە و گۆرەوی خوری دەسکرد، دەمە داس و کەوگیر و بە دیوارەکاندا هەڵواسرابوون. رۆژهەڵاتی بەرجەستە دەکرد، "پاشاگەردانیی رێک". حەمامی شیفام بینی و بە بەردمیدا تێپەڕیم. گەیشتمە سەر پردی تەپەقچەلی. بە دەستی راست موسەڵایە و بە دەستی راستیش بازاری ئاسنگەرانە. لە سەر ریتمێکی تایبەت، چەکوش دەکێشنە سەر ئاسنی سوورەوەبوو؛ داس و ددانی شەنە و مێغزنجیر و کەرەسەی دیکە بۆ کاروباری گوندان دروست دەکەن.

لە ناوەراست پردەکە راوەستام و سەیری ئاسۆی شارم دەکرد. گەرماییەک لە هەموو لایەکەوە بە یەکسانی بەرزدەبووە. دەمویست هەردوو بازووم وەکو خاچێک بکەمەوە بۆ هەتاهەتا شارەکەم بگرمە باوەش. حەزیشم دەکرد هەروا هەنگاو بنێم و بە ناو بۆشاییدا رابوێرم، خۆ نغرۆکە نێو خەونی یەکەم. حەزم دەکرد جارێکی دی دەستی شارستانییەکە بگرم و

به پێکەنینەوە لە نێو دەزووڵەی کۆلارە و فەنەرەکان خۆ رزگار کەین و فەنەرە کوژاوەکان داگیرسێنین و دەزوولە پچڕاوەکانیش پێکەوە گرێ بدەین و بیگەڕێنینەوە دەستی منداڵان و ئەوانیش بە ئاسپایی دەستمان بۆ درێژ بکەن و ئەوەیان لە لا نەدرکێنین کە ئەوانیش خەون دەبینن.

چوومە سەر کەرتە خشتێک، خشتێکی زەبەللاح و کراسە فلّتەکەم وەکو چارۆگەیەک کردەوە. لە دوورڕا تیشکی کەرتە ئاوێنەم بەردەکەوت. هەر لە گەمەی ئەجندەکان دەچوو کە لە گەڵ شەیتانەکاندا لە برەو دابن. ماوەیەک بەوجۆرە مامەوە، هەوای گەرمم هەڵدەمژی و رۆحم سەر ئاو کەوت. دەمویست لەسەر ئەو خشتە راوەستم و کراسەکەم وەکو بەیداغێکی رەش بکەمەوە. بەڵام دەبوو ئەو شوینە جێبهێڵم، ئەگینا ماڵی خۆمانم پێ نادۆزرێتەوە!

## سروودی عەدەم

دوێنێ دەرگا سەوزە ئاسنینەکەی ماڵەکەی قەڵام هەر بە کراوەیی جێهێشت. سەرەتایەک بوو، وەک تەونێکیش خۆی لە گێچەڵی خەیاڵ گیر دەکرد. ماڵ نەبوو بەڵکو کووچە باریک و زیگزاکان بوو و دەیبردینە بەر دەرگای عەدەم. بە هێز و ویستێکی زۆرەوە دەیویست خەسڵەتی ماڵی هەبێت و ماڵیش وەک سەراب لێم دووردەکەوتەوە. وام هەست دەکرد دوێنێ پەقرەنجە بەفراوێکە دەرژێتە سەر جەستەی بیست و هەشت ساڵەم. لە پڕێکدا رادەچەڵەکێم. دوێنێ بە ماندوویی قەڵام لە دووی خۆ جێهێشت؛ کە ئاوڕم لێی دەدایەوە دەتوت هێلانەیەکی پێش مێژووە، هەتاوێکی گەرم سەدجار گەورەتر لە هەتاوی ئاسایی بۆی بووەتە سەرپۆش و سێبەر و شێی کووچەکانیش پووشوپەڵاشی ژێرییێتی. قەڵا شوێنێکی بەرزە، لە هەمان کاتیشدا قووڵە، رەنگە قەڵا قووڵاییەکی بەرز بێت.

لە ڕاستیدا، تەنها چەند مانگێک ماڵمان لە سەر پشتی قەڵا بوو. وەک دەوترێت زەمەن ماددەیە، بەڵام ماددەیەکی جیوینەیە، هەندێجار بە ئاسانی هەست بە ڕەوتی زەمەن دەکەین، بەڵکو دەتوانین بیپێوین، هەروەها دەیبینین چۆن سەر دار و دیوار دەکەوێت، چۆن بە سەر ستارەکاندا دادەچۆڕێت، لە هەندێ شوێنیش وەکو قیر دەمەیێ؛ لە هەندێ شوێنیشدا هەند بە خێرایی دەڕوات و تێدەپەڕێ، هەستی پێناکرێت و دەتوێتەوە و دەبێت بە هیچ. بۆیە خەون و زەمەن زۆر پێک دەکەن!

زۆرجار ئینسان بێهودە خولیای سەرەتا دەبێت. بە کەی و چۆن پرسیار ئاراستەی سەرەتا دەکات. با ئێمەش دوێنێ بکەینە سەرەتای ئەم گەڕان و پشکنینە. سەرەتایەک بچووک وەکو نووکە دەرزی، بەڵام چرکە دوای چرکە گەورەتر و هەراشتر دەبێت. بانگم دەکات و دەیەوێت قووتم بدات. ئەو دەیەوێت بمکاتە خۆی و منیش بێوچان دەمەوێت بیکەمە خۆم. ئەمە گرەوێکە هەر خۆم دەسپێشخەریم. درزێکە وەکو چارۆگەی پاپۆڕێک پڕ با دەبێت، کاتێکیش دەلەرێتەوە زاکیرە دەبووژێنێتەوە: تەپوتۆز لە سەر ئەو ڕچە باریکانە هەڵدەداتەوە، بۆ ڕێبوارانیش خاوێنی دەکاتەوە. سەرەتایەکە دەیەوێت مانا بداتە هەنگاوەکانم.

ئیتر لە دوێنێوە پەیوەندییەکی دیکەم لە گەڵ دەرگا و پەنجەرە و دیوار و بەرد، بە کورتی لە گەڵ هەموو بەرجەستەیەکی دیکەی ئەم شوێنانەدا هەیە. چونکە ئەم بەرجەستانە بە بێئامان وەزیفەی یەکەمی خۆیان ون دەکەن و دەبنە چاووگ بۆ ورووژان.

ئیمرۆش دەبێتە دوێنێی و کەواتە دەبێت ڕوو بکەمە قوتابخانەی "ئەلحیکمە" پێش ئەوەی ناوی "مەشخەڵ"ی لێبێن؛ خۆشترین ناو بۆ ئەو سەردەمە. ئەم قوتابخانەی سەرەتایی بوو، ڕۆژان و بەیانیانی ساڵانی شەست و پێنج و شەست و شەش و شەست و شەش و حەوت و هەشت و نۆم دەخەنەوە یاد. هەموو ئەو بەیانیانە بە یەک دەچوون. بەیانیانی غوربەتی و سزا، غوربەتی خۆراهێنان بەو بڕیارە سەپێنراوەی سەرم: دەبێت بچمە

قوتابخانه. واته دەبێت هەموو بەیانییەک بە پێی خۆم بچمە زیندان. خۆ ڕاهێنان بەو زیندانە برینێکی قووڵی تیا جێهێشتووم. غوربەتی ئێواران کاتێک هەموو خێزانەکە خۆ دەپەستنە ژوورێک. ئەو ڕۆژانە تامی خەلۆز بە مەلاشوومەوە جێهێشتووە.

ئەگەر لێرەوە و لە ئێستادا سەیری ئەو کاتانە بکەین، ئەو کاتە درەختێک دەبینین، بەرەکانی توخمی شەوەزەنگێکی ئەنگوستەچاون و لە نێو ئاووهەوایەکی ژەهراویی هێنراونەتە بەرهەم. ڕووباری لیڵ ئاوی دەدات وهەوای کوشندەش لقەکانی دەلەرێنێتەوە. تەپوتۆزی ئەو ڕۆژگارانە لە سەر گەڵا و لقوپۆپەکانی نیشتوون، توێژ لەسەر توێژ کۆبوونەتەوە. ڕۆژگارە بێهودەکانی بەجۆرێک لەسەری کەڵەکەیان بەستووە، لە دوورەوە لە جەنگەڵی غوبار دەکەن.

هەر لەو ساڵانەوە پیاوە پووچەکان، ئەوانەی وەکو مۆمیا لە جیاتی خوێن و دەمار بە لەشیانا بگەڕێت، ناوەوەیان پڕ پووش کرابوو. بە ویست و نەویست زەمینەی کۆدەتا شوومەکەیان ساز دا. لە گۆڕەپانی قوتابخانەکەی ئێمەوە ئەو زەمینەیە خۆشدەکرا و لە نێو خیزانەکانیش دەرسەکان دەوترانەوە و لە دامودەزگاکانیش قەوارەی وەردەگرت و دەبوونە کرداری مێژوویی. مامۆستا نەزان و پیرمێردی پەروەردەی دەورانی مەعاریف و دەسەڵاتە ئاخروئۆخرەکانی عوسمانی. هەموو لەسەر مەنهەجێک کە لە سەر بناغەی پاداشت و سزا خەملابوو، بە ئێمە دەوترایەوە. تاکو ئێستاش ئاسەوارەکانی دیارن. بە نەخشی جومجومەیەک دەکات لە مەچەک کوترا بێت. بەڵام ئێمە تەنها هەر سزاکانمان بە ڕێکوپێکی دەبینی. پاشان لە مامەڵەو سەوداکانی سیاسەتدا، بە مەنهەجی "گێزەر و چەکوش" دەناسرایەوە.

ئامانجی ئەم مەنهەجە یەک شت بوو: ئەویش فێری ملکەچیمان بکەن. نەوەیەکی ملکەچ بەخێوبکەن. ئەم وشەیە پێویستی بە تەفسیر و لێکدانەوە نییە. هەرکەسەو لە لای خۆییەوە دەبووە بورغییەکی ئەو مەکینە زەبەللاحەی کە درەنگتر تەڕ وهیشک پێکەوە دەسووتێنێت و کاریگەرییەکانی دەگەنە

وڵاتانی دەرەوەش. ئەو مەکینەیە هەر ئەوەندە زەحمەتە کە بکەوێتە هەرەکەت، ئیتر وەستانەوەی بۆ نییە، نەک ئەمەو بەس، بەڵکو کەس پێی راناگیرێت. ئەو سەرلەبەیانییانەیان وەکو گوانی مانگایەک دۆشرا و شیرەکەیان لە بەیانییەکی ساڵی هەزار و نۆسەد و شەست وهەشت فڕ کرا. ئەوەی فرچکی بەو شیرە گیرا، ئاژاوە و عەشقی شەڕ و گێچەڵ دەچێتە هەموو شانەکانی جەستەیەوە، دەچێتە موولوولەی خوێنەوە، تێکەڵی جینات دەبێت.

سێبەرە سروشتییەکانی قەڵا بە جۆرێکی بڵح تا دەهات ئاسمانی شاری دادەپۆشی. سێبەر تێکەڵی خوێن دەبوو، لە سەر شۆستەکانی بۆنی دەهات، لە باڵەخانە رەسمییەکانیش ترس هەڵدەتۆقی، دەور و بەری شاریش دەبووە سەربازگە، رەنگێکی خاکی دەدایە هەموو شتێک. کودەتا لە چەند رۆژێکدا کۆتایی دێت، بەڵام سێبەرەکانی زوو گەشە دەکەن، رۆ دەچنە نێو مێژووی خێزانەکان و ئیتر مێژووی ئەوان دەنووسنەوە و تۆماری دەکەن. ئەو کات مێژوو دەبێتە شەپۆلێکی هیشک، برینەکان رادەماڵێت و دەیەوێت تورِی هەڵداتە نێو گەرووی بیرچوونەوە.

ئیتر ئەو سەرلەبەیانییانە بە زنجیرێک لە یەکتر دەئاڵان و دژە مانایان بەرهەمدەهێنا. واتە مرۆڤ تەنها لەیەک رەهەندا زۆرانبازی لە گەل ژیاندا دەکات. ئەویش هەوڵدانە مانا لە ژیان بقەپێنێت. چونکە ئینسانەکان خۆیان لە تەونێک دەدۆزنەوە کە بەدەرە لەفرەبۆچوون. دووفاقەیی ئەو رۆژانە لەوەدا بوو لەوەی کە نەزۆک بوون، زوو ئاوس دەبوون و رۆشنبیریی خۆی دروست دەکرد و رۆشنبیرانی خۆی دەزێنیت. ئەم تێکەڵوپێکەڵییە، تەنگژە بەرهەمدەهێنیت و لە زاراوە هاوچەرخەکانیشەوە مانا دەقۆزێتەوە و لە مێژووش چەمکگەلێک کە باس لە دادوەری و یەکگرتوویی و ملکەچی دەکات، هەڵدبژێرێت.

کۆدەتا ساتەوەختێکە، بەڵام پێش ئەم ساتەوەختە گرینگترە، بۆ ئەوەی لە هۆکارە راستەقینەکانی تێبگەین. ئەگینا مێژوو کوێرانە، لە بیچمی جیاواز

خۆی دووبارە دەکاتەوە. گۆڕەپانی قوتابخانەکەی ئێمە یەکێک بوو لە گۆڕەپانە هەرە بە پیتەکان بۆ سەرهەڵدانی ئەم کۆدەتایە. دەبێتە جێی مەشق و خۆراهێنان، راهێنانی وەچەیەک کە هەند نابات دەبێتە سووتەمەنی گشت شەڕە دۆڕاوەکان. بەیانیانی زۆر زوو، ریز لە دوای ریز ، لەبەر سەرمای زستان، ئێمەی منداڵ، یەک لە تەنیشت ئەوی تر، رادەوستاین. هەندێکمان بە کراسی تەنکەوە، وەکو چۆلەکەی تەڕبوو هەڵدەلەرزین. بەیداغی وڵاتیش لە ناوەند، بە بەرزکردنەوە سروودی بۆ دەوترا. مامۆستاش شوول لە دەست، وەک رەقیبی ئەبەدی، لە تەنیشت پۆل، بەڕێوەبەریش، بە جۆرە توڕەییەکی ئاشناوە، سەیری گشتی دەکرد. سەرما، بەیداغ، حەیزەران، سێکوچکەی ئەو ساڵانەبوو. کە بەیداغ بەرزدەکرایەوە و ئێمەش بە بێ ئەوەی بزانین چ دەڵێین، بە دەنگی بەرز هەمان سروودمان دەوتەوە، لە سەر یەک ئاواز بەڵام بە نەغمەی نەشاز، دووبارە و دەبارەمان دەکردەوە. دەنگی ناسکی منداڵان تێکەڵی ئەم سرووده دەبووەوە: " لاحت رؤوس الحراب، تلمع بين الرواب، هاكم وفود الشباب، هاكم..." بانگەشەیەکی روون و رەوان بوو بۆ جەنگ. ئێمەش سووتەمەنییەکەی بووین. بۆ چەندین دەیەش ئەو شەڕانە پووشوپەڵاشی ئینسانی دەسووتاند. ئەم دەنگانە هەموو رۆژێک، چینێک بەرەو کەشکەڵانی فەلەک بەرز دەبووەوە. لە راستیدا، ئەم سروودانە بۆ لەشکری دۆڕاو دەوتران. لە هەموو وڵاتدا، لەو ئان و ساتە، قوتابیان هەمان سروودیان دەوتەوە.

ئەمە ئەتمۆسفێری گشتی بەیانیان قوتابخانەی "ئەلحیکمە" بوو. منیش دوای دابڕانێکی زۆر، دەمەوێت بڕۆمەوە بۆ هەمان شوێن، لە مێشکمدا هەراوزەنای ئەو بەیانییانە دەبووژانەوە. هەستم دەکرد هەر دوێنێ بوو ماڵمان لە قەڵاوە بۆ گەڕەکی "شەریکە" گواسترایەوە. هەر دوێنێش بوو، وەکو جاران تاقە قوتابی کوردبووم و لە دەرگای موحەجەرەکانەوە دەچوومە ئەو دیوی دیوارەکان. بە نیسبەت منەوە دوو دونیا بوون. دیسانەوە زیندانی

زمان و شوێن بووم. بە ترس و شەرمێکی موزمینەوە سەیری مامۆستام دەکرد.

پاشان زانیم بۆچی نەیانناردمە قوتابخانەی "ئەلئەمین" هەر بە تەنیشت قوتابخانەی "ئەلحیکمە"ەوە بوو. قووتابییەکانی ئەو قووتابخانەیە هەر هەموو کورد بوون. بە تایبەت خەڵکی عەرەسەکەبوون، هەژارترین گەڕەکی کەرکووک. هۆکارەکەی ئەمەی لای خوارەوە بوو. باوکم ببووە مەلای مزگەوتی پاسوانزادە کە لە ناوەندی گەڕەکی بەگلەر بوو، گەرەکێک زۆربەی دانیشتوانی تورکمان بوون. تورکمانگەلێکی زۆریش دەرویان لە باوکم دابوو، هەر ئەوانیش بوون رانمایی باوکمیان کردووە بۆ ئەوەی من بنێرنە ئەو قوتابخانەیە. رێژەی سەرکەوتنی بەرزترە، بە دیسپلینتر و مامۆستاکانیشی هەموو تورکمانن. هەروەها منداڵانی ئەو قوتابخانەیە لە چینە ناوەندییەکەی ئەو گەڕەکانە بوون. لە چاو گەڕەکی عەرەسە کە زستانان قوڕ دەگەیشتە بنمیچییان و هاوینانیش لەبەر مێشووڵە خەویان نەبوو. بە زەحمەت منداڵانی ئەو گەڕەکە شەشی سەرەتاییان تەواو دەکرد و هەندەی نەدەبرد رەوانە باشوور دەکران و بەسەر تاشراوی و بە جووتێکی پۆستاڵی نابووتەوە دەگەڕانەوە مەملەکەتە لە قوڕ دروستکراوەکە.

یەکێک لە ئەکتەرە چالاکەکانی ئەو مەیدانە "ئایندن ئەفەندی" بوو، مامۆستای دەرزی ئاین بوو لە قوتابخانەکەمان و نوێژی جەماعەتی لە پاسوانزادە لە لای باوکم دەکرد. هەر ئەو بووە قەناعەتی بە باوکم کردووە کە کوڕەکەی بەرێتە قوتابخانەی "ئەلحیکمە". ئەو جگە لە دەرزی ئاین، دەنگۆی ئەوەش هەبوو لە رێکخراوەی "برا موسڵمانەکان"دا دەستی هەیە. کابرایەکی زۆر بە دیسپلین بوو؛ ئێمەی منداڵی کردبووە بەندەکانی رێز. پیاوێکی سوور و سپی و گۆشتن بوو، بۆینباغەکەی توند دەکرد و غەبغەبەکی هەندەی دیکە سووردەبووە و دەیگوشی. زۆر بە لەززەت و چێژێکی تایبەتەوە حەکایەتی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەری بۆ دەگێڕاینەوە. باسی ئەسحابە و یاوەرەکانی مەحەمەدی دەکرد، وەک ئەوەی یەک بە یەک

بیانناسێت و هاوڕێیان بووبێت. ڕەشمەی خەیاڵی ئێمەی لە چنگدا بوو، بە ئارەزووی خۆی هەواڵەی بیابانەکانی حیجازی دەکرد و ڕەوانەی گۆڕەپانەکانی ئوحد و بەدری دەکرد. هەندێجاریش خۆی ڕۆڵی یەکێک لە ئەسحابەکانی دەبینی و شمشێرێکی خەیاڵی توند بە هەردوو چنگ دەکرد و لە پڕێکدا رایدەوەشاند و کەللەسەرێکی خەیاڵی دەکەوتە پێشمان.

هەر ئەویش بوو یەکێک لە پۆلەکانی بۆ نوێژکردن چۆڵ کرد، ئەوانەی نوێژیان بکردبایە نمرەی زیاتری دەدانێ و بە دوو قسەی خۆش ڕۆژەکەی لێسووک دەکرد. بە پێچەوانەشەوە، ئەو منداڵەی بە جۆرێک لە جۆرەکان بجوولابایە و هارەبانی بکردبایە، ئەوە زۆر بە توندی دیکێشایە ڕوومەتی و جێی هەر پێنج پەنجەکەی دەبوونە عیبرەت بۆ ئەوانی دی.

لە بازارەکەی ئەحمەد ئاغاوە شۆڕدەبوومەوە و گەیشتبوومە کۆتاییەکەی کە بە ساحەی تەیەران بە ناوبانگە. ئیتر دەبوایە دەستی ڕاست وەرگرم. قەد لەوەوە پێش بیرم بەو شێوەیە لەو ساڵانە نەکردبووەوە. شتە تیکچڕژاوەکان زۆربوون، پێکڕا هورووژمیان بۆ مێشکم دەهێنا. هەنگاوی گورجم دەنا و لە قووڵایی مێشکیشم ئەو بەسەرهاتانە و بۆنێکی پەنهانی ئەو ڕۆژانە لووتی دەچووزاندمەوە. هەرچەندە ڕۆژی یەکەمی قوتابخانەی ئەلحیکمەم نایەتەوە یاد، بەڵام دەزانم ڕۆژێکی گەرم بوو، ڕۆژگارەکانی ئەوکاتیش لە یەک دەچوون. لە ڕوویەکەوە ئەگەر تەماشات بکردبایە، لە دەفتەرێکی سەدلاپەڕیی هیچ لێنەنووسراو دەچوو. هەروەها کتێبی دەرزی ئەو ساڵانەم زۆر بە باشی نایەتەوە یاد، کتێبی پۆلی دووی لێ بترازێ کە تا ئێستاش چەندین لاپەڕیم لە بەرە. زاکیرەیان سیخناخ دەکردین و بە بێ ئەوەی بزانین چیمان ئەزبەر کردووە.

چەند ساڵ لە قوتابخانەی سەرەتایی دەرنەدەچووم. ئاووهەوای ئەو ساڵانە تەمەڵی کردبووم، تەمەڵی زیهن نەبوو، بەڵکو ڕاهاتن تەمەڵی کردبووم، ئەو ئاووهەوایە ناهەموارەی کە هیچ پەیوەندییەکی بە پەروەردەوە نەبوو تەمەڵی کردبووم. ئەم تەمەڵییە وڕکی لە لا دروست کردبووم. لە

جیاتی ئەوەی بیر بکەمەوە، خۆمم تەسلیمی لەشکری خەیاڵ دەکرد، نازانم تا چ رادەیەک فریام دەکەوت، بەڵام جۆرە هەڵاتنێکی ئاشکرا بوو لەو ئاووهەوای پۆل. هەڵاتنێک بوو بۆ ئەو دیوی شورای قوتابخانە و خۆ راهێنانێک بوو بۆ هەڵاتنێکی راستەقینە. زۆرجار کە داڵغەکە بەری دەدام، نیوەی دەرز تەواو بووبوو، ئیتر دەبوایە هیواش هیواش بە قاڵدرمەکانی خەیاڵدا بێمە خوارەوە و تا بگەمەوە ئاستی مامۆستا و قوتابیان. هەندێجاریش لە گەڵ زەنگ لێدان، دەزووڵەکانی خەیاڵم دەپچڕان و کە دەهاتمەوە ئاگا لەشم بۆنی قەرسیلی دەشتاییەکانی گەڕەشیخان و قەرەسالم و سەرجەم ئەو گوندانەی لێوەدەهات کە بینیبووم و نەمبینیبوون. من لە گەوزاندی لەشی خۆم دەهاتمەوە، لە تێکەڵبوونی لەشی خۆم لە خۆڵ و تەپوتۆزی ئەو گوندانە، ئەوانیش خەریکی لەبەرکردنی "جەدوەلولزەرب" بوون.

خۆ ئەگەر دەرزی رەسمیشمان هەبوایە، ئەوە هەندەی دیکە دەچوومە قووڵایی خەونە رەنگینەکانمەوە و بە قەڵەمی رەنگاورەنگ بەرجەستەم دەکردن. "کوچک ئایندن" مامۆستای رەسمان بوو، دەستوخەتخۆش و کورتەباڵا، بۆیە نازناوی "کوچک"یان دابوویێ. زەوقێکی تایبەتی هەبوو، زەوقی ئەو هونەرمەندانەی کە گومان دەکەن کە هونەرمەندن، یا تەنها لە سێبەری هونەرمەندێکی دیکە هەست بە بوونی خۆیان دەکەن. زوو زوو سەفەری ئەستەمبوڵی دەکرد، هەر جارێکیش لە ئەستەمبوڵ بگەڕابایەتەوە، قاتێکی دیکەی دەکرد بەر، لەوەی پیشووتر سەرنجراکێشتر و دەگمەنتر بوو. لاسایی هونەرمەندە تورکەکانی ئەوکاتی دەکردەوە، هەندێجاریش جووتێک سمێڵی ئەستووری بەردەدایەوە و هەندێجاریش پاک و لووس دەیتاشی. وا باو بوو کە عارەقخۆرێکی بەربادە. کاتێک دەهاتە پۆلەوە، سەرەتا پێش هەموو شتێک بە تەباشیری رەنگی، بە خەتێکی جوان مێژووی رۆژ و مانگ و ساڵی لە کەناری تەختەرەشەکە دەنووسی و پاشان رووی دەکرد ئێمە و دەیوت: " فلملاری چخاردن" واتە "فلیمەکانتان دەرهێنن". چونکە یاری ئەو

کاتی ئێمەی منداڵان ئەوە بوو، فلیمی ئەکتەرە ناودارەکان کۆبکەینەوە، بە تیابەت ئەکتەرە هیندییەکان وەکو ئەشاپاریخ و شامی کاپوور و شاشی کاپوور کەمتریش راج کاپوور کە برا گەورەیان بوو. هەروەها کوڕە ئازایەکە کە ناوی دارامەندەر بوو. هەروەها فلیمەکانی زۆرانبازی کە لە حەکایەت و ئەفسانە یۆنانییەکانەوە وەرگیرابوون وەکو سەمسۆن و هێرقل هتد. دوا بە دوای فرمانەکەی کوچک ئایندن هەر منداڵە و بێ ورتە دەڕۆیشت فلیمەکانی لە گیرفان دەردەهێناو لە سەر مێزەکەی بەردەمی هەڵیدڕشت. پاشان کوچک ئایندن فلیمەکانی یەکە بە یەکە هەڵدەگرت و دەیخستە بەر رووناکی پەنجەرەکە و سەیری دەکردن، پاشان دەیخستنە تەنەکەی خۆڵ و خاشاکەکەوە و ئاگری تێبەردەدان. بۆنێکی ناخۆشی نایلۆنی سووتاو بە پۆلەکەدا بڵاودەبووەوە.

ئینجا تەباشیرە رەنگییەکانی ریز دەکرد و دەستی دەکرد بە کێشانی تابلۆیەکی تەباشیریی لە سەر تەختە رەشەکە. پێی دەچوو کاریگەریی ئینتیباعییەکانی فەرەنسی لەسەر بووبێت، بۆیە هێڵەکانی بە هی سیزان دەچوون. مامۆستای هونەر بوو بەڵام بڕوای زۆری بە یاساو رێساو دەستوور و دیسپیلین هەبوو. دەیوت نابێت یەک تۆزقاڵ کاغەز بە سپێتی بمێنێتەوە. دەبێت هەموو سووچێکی کاغەزەکە رەنگ بکرێت. وانە سەرەتاییەکانی هونەر لە قوتابخانەکان هەر هەندە بڕ دەکەن. پێی دەچێت هەندە کاری دیسپیپلین ببینێت هەندە کاری بە خولقاندنی هونەرییەوە نەبێت. بۆیە درەنگتر، کاتێک کارەکانی تۆلووس دو لۆتریک-م دەبینی، بە تایبەت ئەو تابلۆیانەی کە وا هەست دەکرێت کە هێشتا تەواو نەبوونە، هەندەی دیکە خەیاڵی داوەت دەکرد بۆ ئەوەی خۆی ببزوێنێت و بەشداربێت لەو خەلقە هونەرییە.

ئینسانە رەسمکراوەکانی کوچک ئایندن درێژکۆڵە و باریک بوون، بە سێبەری شتیان دەکرد، بە ئاشکرا کاریگەریی فایق حەسەنی بەسەرەوە بوو، کێ ناڵێت لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا، فایق مامۆستای نەبووبێت!

ئەوەی کارەکانی کوچک ئایندن-ی لە هی فایق حەسەن جیا دەکردەوە، ئەوە بوو کە ئەوانەی کوچک بە سورگییەکی لباد، پێش دەرز تەواوبوون، کاتێک دەیسڕییەوە، پێش ئەوەی ئەو گەردانە بکەونە ژێر پێڵاوی قووتابیان، گەرد و تەپۆزێکی رەنگین پۆلەکەی داگیر دەکرد و دادەمرکانەوە.

هەر لەو ساڵانەوە ئیتر چێژ و زەوقم بۆ رەسمکردن گەشەی کرد، درەنگتر دەیکەمە خولیای خۆم. ئیتر هونەر بۆ من بوو بە یەکێک لە رچەکانی هەڵاتن. ئەم هەڵاتنە سەرەتا خۆنوشتاندنەوەیەک بوو بۆ سەر کاغەزە سپیی و هیچ لەسەر نەنووسراوەکان و دەمویست سەرلەنوێ ئەو جیهانە نیوچڵەی ئێمەی پێ تەواو بکەم. هەستم دەکرد جیهان نوقسانە و بەو رەسمانە من تەکامول دەکات. من لێپرسراو بووم لە تەواوکردنی ئەو نوقسانییانە. لە راستیشدا، ئەوەی من دەمکرد، هیچ پەیوەندییەکی بە هونەرەوە نەبوو، بەڵکو گەڕانێک بوو بۆ دۆزینەوەی ئەو کاتانەی کە ونم کردبوون. شتی سەیر ئەوە بوو، لە تەمەنی هەشت نۆ ساڵییدا، دەبێت چی کاتێکم لێ ون بووبێت تا وا بە پەرۆشەوە بە دویدا وێڵ بم. لە راستیشدا، کێشەیەکی سایکلۆژی بوو زیاتر وەک هونەری. کێ ناڵێت هەستم بەوە نەکردبێت کە مانەوەم لە سەر ریحلەی قوتابخانە خۆی لە خۆیدا کات ونکردن نەبووبێت؛ بۆیە ئەو کاتانەم لە ژێر نووکی قەڵەمە رەنگییکانمەوە دەدزییەوە و دەمقۆزتەوە و دەمکردنە هێڵی رەنگینی سەر کاغەزی سپی. پاشانیش بە بێ ئەوەی بزانم لە چ قوژبنێک، چ تەنەکەی خۆڵ و خاشاکدا دەبوونە دوا مۆزەخانە بۆیان. هەر شتەو چارەنووسی خۆی لە گەڵ خۆیدایە!

خۆم بەرامبەر بە دەرگا قاوەییەکەی قوتابخانەی ئەلحیکمە دۆزییەوە. بیست و سێ ساڵ لە پشتمەوەیە. ئەم قوتابخانەیە دیوێکی دیکەی ماڵمان بوو. حەزم دەکرد پاڵ بە دەرگاکەدا بنێم و بڕۆمە ژوورەوە. ئارەزووی ئەوەم هەبوو سەرێک لە گۆڕەپانەکە بدەم، سەیری ریزە پۆلەکان بکەم، سەیری باخچەکەی پشتەوە بکەم و گۆڕەپانی تۆپی پێ و هتد...لە پشتی

پشتەوەش، درەختە کەسکەکانی قەبرسانەکەمان لێوە دیار بوون، دارتوویەکی گەورەی لێبوو، هاوێن توومان لێدەکردەوە.

بە حەپەساوی چەند چرکەیەک لە پێش دەرگاکە راوەستام. دەستم بۆ زنجیرەکان برد کە قفڵێکی پێوەبوو و سەیری قفڵەکەم کرد، دانەخرابوو. دەرگاکەم بەرەوخۆم راکێشا، کرایەوە. دەبوایە سێ و چوار مەتر بڕۆم تا دەگەمە دەرگا تەختەکە. ئەویش بەکلیل دانەخرا بوو، بەڵام پێوەدرابوو. پێی دەچوو یەکێک لە ژوورەوە بیت، چونکە لە رۆژانی هاوینیش دوو رۆژ لە هەفتەیەکدا، بەرێوەبەر یا موعاوین دەهاتن و کاری بەڕێوەبردنیان ئەنجام دەدا. پاڵێکی هێواشم بە دەرگاکەوە نا، کرایەوە. چوومە ژوورەوە. فێنک بوو، تا رادەیەکیش بۆنی شێ دەهات. هەندێ پۆستەر بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوون، نەخشەی جیهان و ئاڵایەک و چەند مێخێکیش بۆ هەڵواسینی قاپووت و قەمسڵە. بە لای دەستی راستیش ژووری هەردوو فەڕاشەکەبوو: کاک عوسمان کە کورد بوو و عەممی حوسێن-یش تورکمان بوو. سەرەرای بەساڵاچوونی عەممی حوسێن، کاک عەسمان گەنج بوو و سمێڵێکی باریک و باریکەڵانە بوو. نازانم لەبەر چی بوو دانوولەیان پێکەوە نەدەکوڵا. لە ژوورەکەی تەنیشتیشی، کەرەسەی تۆپتۆپێن و کەرەسەی دەیدەوانی و بەیداغ و شتی پەروەردەیی لێبوو.

لە سەرخۆ هەنگاوم دەنا. سەیری کاشییە چەمەنتۆییەکانم دەکرد. وەک بڵێی هەر بستە کاشییەک چیرۆکێکی پێ بێت. لە دوێنێوە هەستەکانم بە جۆرێکی دی دەمبزوێنن. سێ شوێن لە یەک شوێندا کۆبۆنەتەوە. هەر هەستێکیش سێ رچەی لێ جودا دەبێتەوە. لە قافڵەکانی شەوەوە بۆ شەوە ساردوسڕەکان، لە نێوان ئەو قافڵە و شەوە ساردوسڕانەش، ئەتمۆسفێری قوتابخانە موچرکی زیندانیی لە لا دروست دەکردم. بێگومان زۆر شتی دیکە هەن، من نەمبینیون. لە نێوان ئەو قافڵە تاریکانەی کە بێوچان دەیخستمە نێو هەگبەکەیەوە، کون و کەلەبەری دیکە هەن. نەمدەتوانی بە ئاسانی دەست

بەسەر شتەکاندا بگرم. شتەکان سرک بوون و خۆیان لە ژێر هەستەکانم رادەپسکاند. بەتاڵیەک هەبوو نەمدەزانی چۆن بیدوێنم.

سەیری دیوارەکانم دەکرد و لە خۆم دەپرسی ئایا ئەم دیوارانە لاڵن یا توانای گێڕانەوەیان هەیە؟ نەمدەزانی چۆن بیانهێنمە زمان، چۆن و بە چ زمانێک باسیان لێوە بکەم. زمانم لە گۆ دەچوو، بێدەنگییەکی درێژ جێگای زمانی دەگرتەوە. ئەم دیوارانە وەکو تابلۆی ئەپستراکت دەهاتنە پێشچاوم. حەزیشم دەکرد ئەم دیوارە لە بنەوە هەڵتەکینرێت و لە مۆزەخانەیەک، وەکو خۆی، چوارچێوەرێژ کرێت، بۆ ئەوەی تەماشاکەران بێن و تەماشای بکەن. مانا لەو تەماشاکردنانە لە دایکدەبێت. بێدەنگبوون بەرامبەر ئەم دیوارانە، بێدەنگییەکی گەلحۆیانە نییە، بەڵکو حەپەسانێکی پۆزەتیڤ جێگای دەگرێتەوە. دەمویست کە گەڕامەوە فەرەنسا دەست بە نووسینەوەی ئەم بێدەنگییانە بکەم. هەوڵی من ئەوە بوو کە توێژێک لە سەر ئەو دیوارانە هەڵدەمەوە، وەکو توێژە سەرابێک، بەرزی کەمەوە ئاستی هەڵوەشانەوە گشتی. هەڵوەشانەوەیەک بۆ ئەوەی سەر لە نوێ دایانمەزرێنمەوە و سەر لە نوێ بنیاتیان بنێمەوە. رەگەزەکانی لەیەک مارە بکەم و ئیتر لە توانایاندا هەبێت بێنە زمان.

من هیچم نەدەوت. ئەوان کەوتنە گێڕانەوە سەرجەم بەسەرهاتەکان. وەک دەڵێن دەنگ ماددەیە، کەواتە دەنگ ون نابێت، هەر وەک چۆن ماددە ون نابێت، بەڵکو شیکل وفۆرمەکانی دەگۆڕێت، لە بارێکەوە دەچێتە بارێکی دییەوە. کەواتە ئەو دەنگانەی کە بەرز بوونەوە، لە قوژبنەکان خۆیان مەڵاس داوە، لە سەر دیوار و ستارەکان خەوتوون، لە بنمیچەکان پشوو دەدەن، تێکەڵی فەزا بوونە. رۆژێک دادێت ئامێری ورد و سۆفیستیکە و پێشکەوتوو دابهێنرێت، بۆ ئەوەی ئەو دەنگانە کۆ بکاتەوە و تۆماریان بکات: دەنگە هەڵوەشاوەکان، دەنگە کپبووەکان، دەنگە دێرین و بە سەرچووەکان، سەرلەنوێ پێکرا بیانهێتەوە ژیان. ئەو کاتە هەموو بۆچوونەکانمان لە مەڕ مێژووەوە گۆڕانکاریان بەسەردا دێت، مێژوو لە زانستەوە دەبێتە ژیان. نابێتە

گێڕانەوە بەسەرهاتی فلانە کەس و فسیارە دەسەلات، بەڵکو دەنگی سەرجەم بوونەوەران لە خۆ دەگرێت

تاقە ئامێری منیش لەم پرۆژەیەدا، تەنها هەر زاکیرە بوو، راستر زاکیرە و قەڵەمێک بوو؛ لە هەوڵی ئەوەدا دەبم دەنگی ئەو منداڵە بەسزمانانە بدۆزمەوە و سەر لە نوێ بیانووسمەوە. ئەو دەنگانەی کە هەموو سەر لە بەیانییەک، ئا لێرە، ئا لەم گۆڕەپانەوە بەرەو ئاسمانەکان بەرز دەبوونەوە، بەروە ئاسمانە بێسەداکان. دەمویست نووکی قەڵەمەکەم وەکو قولاب فڕێ دەمە ئەو زەڵکاوە بێدەنگەو دوای زایەڵەکانی دەنگ بکەوێت، زایەڵەی ئەو سروودە بێکەڵکانەی رام کات و بەرەو رۆژگارەکان بەرزیان کاتەوە. حەزم لە موغامەرەیەک بوو.

بە دەم بیرکردنەوەوە دیوارەکانم جێدەهێشت و بەرەو حەوشی قوتابخانەکە هەنگاوم دەنا. گەیشتبوومە ناوەندی حەوشەکە، ئەو حەوشەیەی هەموو پێنجشەمووانێک دەبوایە بەیداغی نیشتیمانی تیا بەرزکرێتەوە و لە کاتی بەرزکردنەوەشیدا سروودی تایبەتی بۆ بوترێت. دەبوایە هەموومانیش دەستی راست، تاکو ئاستی چاو بەرزکەینەوە، لە نێوان گوێ و برۆی چاوی راست، رەپ رایگرین؛ وەکو سەربازیش سەیری ئەو پارچە پەڕۆیە بکەین کە لە سەر خۆ بەرز دەکرایەوە. دەشبوایە پێشوەختیش، هەر کەسە و دەسەسڕی تایبەتی خۆی لە ژێر دەست رادەبگرتایە و نینووک قرتاو و دەموچاو شۆڕاو و مامۆستاش خێرا هەردوو ریزەکەی بەسەر دەکردەوە و حەیزەرانی دەکێشایە دەستی بێ دەسەسڕ و دەستی نینۆکدرێژ و پیسوپۆخڵ. حەیزەرانی دەکێشایە پشت دەست. ئەو کات فووکردنیش هیچ کەڵکی نەبوو. بەو بەیانییانە زریکە و فیزاحی منداڵان تا کەشکەلانی فەلەک بەرزدەبوونەوە. پاشان بەڕێوەبەر ناوی غایبەکانی دەخوێندەوە و قوتابی غایبی دوێنێ و پێرێ، بە لەرزەوە بەرەو رووی بەڕێوەبەری لەڕ و لاوازی عەینەک لەچاوی حەیزەران بەدەست. بە دەنگە کەرخەکەی هاواری دەکرد و دەیوت: " *ئاچ، ئاچ، ئاچ*". واتە "بیکەوە"، مەبەست کردنەوە دەست بوو. هەندە بە خێرایی ئەم وشەیەی دەوتەوە، ئێمە تەنها گوێمان لە وشەی "چ" "چ"

دەبوو. لە گەڵ لێدانی هەر دارحەیزەرانێکیش، بەڕێوەبەری پیر و ئوفتادە، خۆشی هەندێک بەرزدەبووەوە. ئەمە سزادانی تەنها تاکەکانی کۆمەڵ نەبوو، بەڵکو سزادانی کۆمەڵ بوو بە گشتی. ئەم گوێڕایەڵییە پاشان دەبێتە سووتووی شەرەکان و بەسەر خۆیاندا دەشکێنەوە.

بێگومان ئێستا رۆحی ئەو دەنگانە لە شوێنیکدان، وا لەو بەرزاییانەن.

هەموو بەیانیانێک دەرگای قوتابخانە بە دەنگی سزا دەکرایەوە و بە دەنگی سزا دادەخرا. تاقە ئارەزووی منیش ئەوە بوو کە خۆم لە دەنگی ئەو سزایانە دوورخەمەوە و نەگەڕێمەوە سەر ریحلەی قوتابخانە. ئەو رۆژەشی کە یاخی بووم، بوو بە تەحتیلی نیشتیمانی! ئەو رۆژە بوو بە رۆژێکی نیشتیمانی. بەڵام هۆکاری ئەم تەحتیلە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبوو. ئەو رۆژە بوو کە هەلیکۆپتەرەکەی سەرەککۆمار تووشی خەلەلی هۆنەری دەبێت و لەو ئاسمانە دەسووتێت و کەسیش رزگاریی نابێت. کوردانی ئەو زەمانە ئەمەیان بە حوکمی یەزدان لێکدایەوە. ئەمەیان بە سزای رەحمان تێگەیشتن.

من ئاگام لە هیچ نییە. خۆم لە قوتابخانە دزیوەتەوە و بە دەوری ماڵی خۆماندا خول دەخۆم. باوکمیش هێشتا نەچۆتە مزگەوت. بە پێش دەرگای ماڵی خۆماندا تێدەپەڕم، باوکم دەبینم و بە پەنجەی شایەتمان بانگی دەکردم: "وەرە" پەنجەکەی دیشی لەسەر دوگمەی رادیۆکە دانابوو، دەیوست دەنگە سافەکەی بێژەرەکە بدۆزێتەوە. منیش لێی نزیکبوومەوە و بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وتم: "*مەڕۆ بۆ مەکتەب، وەرە دانیشە*". ئەم رستەیەم زۆر لە لا سەیر بوو، چونکە باوکم بۆ نەچوون بۆ قوتابخانە موساوەمەی نەدەکرد. بەڵام دڵی خۆشکردم. هەندەی نەبرد گەڕەک ورووژا و هاوسێیان، یەک یەک، دوو دوو کۆبوونەوە و لە نێوان خۆیاندا کردیانە فسکە فسک. کەس نەبوو بە ئاشکرا دڵخۆشیی خۆی دەرخات، بێجگە لەو پیرەژنەی هاوسێمان نەبێت کە چەند مانگێک بوو لە گوندەوە هاتبوو، پێکەنێنێکی تێکەڵ بە گریان کرد و سەر پێپلیکانەکە کەوت و سەیری ئاسمانی دەکرد. ئەو

پیرەژنە بوێرە نەیتوانی دڵخۆشی خۆی بشارێتەوە. لە چاوە بچووکەکانییەوە هەستم بە بریقەی هیوا دەکرد و ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژیش لە گەڵمدا گەورە دەبوو.

ئەو ڕۆژە بوو بە هودنە. هودنەی جەنگی ساردی نێوان من و قوتابخانە. بەڵام هودنەی لەوجۆرە ئەگەر یەک کەڕەتیش ڕوو بدات، جێی سەرسوڕمانە. ئازادی بە نیسبەت من ئەوە بوو کە ئیتر نەچمەوە قوتابخانە و بۆ هەتا هەتاش پشت لەو دیوارانە بکەم. هێزێکی هەندەشم شک نەدەبرد کە شۆڕشێکی لەوجۆرە بەرپا بکەم کە چوارچێوەی شتەکان بە تەواوی لێکبترازێنم. بێهێز بووم بەرامبەر بە کۆمەڵ، بەرامبەر بە خیزان، بەرامبەر بە دابونەرێت و دەستوور و ڕێسا. لە کۆتاییشدا، لەو کۆمەڵانە حەپسی بە کۆمەڵ لە ئازادی تاکە کەس تامی زیاترە. کۆمەڵ بە ویست و نە ویست پارێزگاری لەو حەپسە گەورەیە دەکات کە خۆی دروستی کردووە. چونکە لە ئازادی تاکەکەس دەترسێ، زراوی دەتەقێ. تاکەکانیش دەمامک لە دوای دەمامک بۆ ڕوخسارە سوواوەکانیان دەدۆزنەوە. پێکەنینێکیش لە ئەزەلەوە بە ڕووی ئەو دەمامکە دەسکردانەوە هەڵدەشاخێت. پاسکال وتەنی مرۆڤ بە دەمامکەوە پێشدەکەوێت.

نیازم بوو حەوشەی قوتابخانەکە بەجێبهێڵم و نەشمدەزانی سەعات چەندە، هەندەم دەزانی کە دوای نیوەڕۆیە و خەریکە لە عەسر نزیک دەبێتەوە. لە دوێنێشەوە لە ماڵەکەمان دەگەڕێم و هێشتا نەمدۆزیوەتەوە. دەرگا و زنجیر و قفڵەکەی قوتابخانەم لە دوای خۆم جێهێشت و بەرەو کۆڵانەکەی خۆمان دەڕۆیشتم. سەیری ڕوخساری هاتوچۆکەرانم دەکرد و گوێم لە مۆسیقای دەنگیان گرتبوو. سێبەرەکان سرت و خێرا، چاوەکانیان تیژ و دەتوت گڕکانن. هێواش هێواش بەرەو خانووەکانی شەریکە دەڕۆیشتم، وردە وردە دەنگ و هەراو زەنای بەیانیانی ئەو ساڵانەی قوتابخانە دادەمرکانەوە. ئەم ڕیزە خانووانە کاتی خۆی ئینگلیز بۆ کرێکاران و ستافەکانی شەریکەی نەوتی کەرکووک دروستی کردبوون، بۆیە بەم گەڕەکە

دەوترا گەڕەکی "شەریکە". لە راستیشدا لە دوو جۆرە خانوو پێکهاتبوون، هەندێکیان بە راستی شەریکە دروستی کردبوون کە بە کەرپووچی سوور و لە سەر دەستووری خانووەکانی بەریتانیا دروستکرابوون و هەندێکی تریشیان خانوونە تەقلیدییەکانی کەرکووک بوون: قایە و بەردی سپی و کەچکاری و هەندێ خانووش گومبەزێکی بچووکی هەبوو. گەڕەکی عەرەسەش لە پشتەوە بوو، خانووەکانی لە گڵ دروستکرابوون، دەرگای نزم و دیوار نەوی، هەموو دانیشتوانەکەشی کورد بوون. کەچی گەڕەکی شەریکە تێکەڵبوو لە ماڵی کورد و تورکمان.

گەیشتمە سەر سووچی کۆڵانەکە، ساڵی شەست و پێنج بە هەموو ئازارەکانییەوە تەقییە بەر پێم. ئازاری برینێکی هەراش بوو، خوێنیش لە هەموو لایەکەوە فیچقەی دەکرد. ئەو چێشتەنگاوەم هاتەوە یاد کە پیکابێکی بۆر لە بەردەم ماڵمان رایگرت و پیرەمیردێکیان بە سێ کەس هەڵگرتبوو و هێنایانە خوارێ. جەمەدانییەکەی خڵتانی خوێن و دەرپێ سپییەکەی بۆر هەڵگەڕابوو، سەڵتەکەی هەڵگەچراو، خوێن و خۆڵی هیشکەوەبوو رەش دەچووەوە، یەک دوو چمکی فەقێیانەکەی سوورکردبوو، یەکێک لە فەقێیانەکان کرابووەوە لە سەر عەرزەکە دەخشا. رەنگ هەڵبزرکاو، بێ ئاگا، سەری وەکو چۆلەکەیەکی مردارەوە بوو لار کردبووەوە سەر زەمەنێکی مەیوو: باپیرە بوو!

گریان تێکەڵ بە بێدەنگیی، جوێن و داشۆڕیی تێکەڵ بە ملکەچی، شپرزەبوون تێکەڵ بە خۆڕاگرتن، شیوەن و شینیش تێکەڵ بە ناڕەزایی. ئەمانە وەڵام بوون.

**وەڵامی تاوانێک!**

پێرێ بەیانی سەعات نۆ و نیو، حەرەس قەومییەکی گەنم رەنگ، بە تفەنگێکی ئینگلیزی، فیشەکێکی نایە تەوقی سەری پیرەمێرد و لایەک لە شەویلاگەکەی هاڕی و تیلێک لە زمانی قرتاند. بە مەبەستی کوشتن تەقەی لێکرابوو. عەشایەریش لە ناو خۆی لێکدانەوەی خۆی هەیە. یەکێکیان وتی:

*"ئەو سەر لەبەیانییە حاجی خدر کەمێک شلەژابوو، یەک دوو جار هاموشۆی ماڵی کرد و یەک دووجار دەستی بۆ سەعاتە زریزەدارەکەی بەر باخەڵی درێژکردبوو و بۆ جاری سێیەم گومانیان لێکرد و گوللەیەکیان پێوە نا."* دەنگێکی دی لە ژووره تاریکەکەوە بەرەو رۆشناییەکە دەهات: *"ئاخر بۆچی هەندە هاموشۆی ماڵەوەی کرد، ئاخر بۆچی؟"*. دەنگێکی دی لە ناو گەروویەکی سووتاوی نوقمی هەنسک، لە پاڵ رستەکەی پێشوو، ئەمەی لای خوارەوەی درکاند: *"بۆچی لە ماڵەوە دانەنیشت."* جار نا جاریَ رستەی لەم بابەتە، بە بۆچی دەستی پێدەکرد و بێوەڵامیش ئوقرەی دەگرت. لە راستیدا ئەمانە پرسیار نەبوون، چاوەڕوانی وەڵامیان لینەدەکرا. گلەیی و سکاڵا بوون. پرسیار بوون ئاراستەی قەدەر دەکران. ئەم بۆچییانە وەکو بلّقی سەر ئاوکەوتوو دەمیان دەکردەوە و بۆ هەتا هەتا پووچ دەبوونەوە.

هەر خێرا، شەرواڵ و دەرپێیە کوردییەکەیان شاردەوە، جەمەدانی و کراسە خلّتانەکەی وەکو پارچە ئێسقانی لێهاتبوو، دەترسان بۆنەکەی سیخور راکێشێت.

سەعات یانزە و نیو، بۆ رۆژی دوایی گەیاندبویانە خەستەخانەکەی کەرکووک. چەند سەعاتێک بەسەر پشتی گوێدرێژێکەوە، هەندە هەڵتەک هەڵتەکی کردبووم خوێنێکی گەشی لەبەر رۆیشتبوو، ئەمەش بەس بوو بۆ پیرمێردێکی بەساڵا چوو، لە هۆشخۆی بچێت و ببورێتەوە.

دایکم خەریکی ئەوە بوو کون و قوژبنێک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی جلوبەرگە خوێناوییەکەی تیا بشارێتەوە. ئەم کارە زۆر سەرنجی منی رادەکێشا و تێنەدەگەیشتم بۆچی دەبێت جلوبەرگەکانی بشارنەوە. لە کۆتاییدا، لە کونوکەلەبەرەکانی دیواری حەوشە، جلوبەرگەکانیان تیا ئاخنی. تا رۆژی ئیمرۆش کەس نەیدۆزییەوە.

ئێمە دەمێک نییە لە دەستی شاڵاوی حەرەس قەومییەکان "زەردک" و "گەڕەشیخان"مان جێهێشت و هاتینە سەر پشتی قەڵا بۆ ئەوەی کەمێک بحەسێینەوە، دەمێک نەبوو لە دەست کارەسات رامانکردبوو؛ ئا ئەوەتا

جەستەیەکی دەم بە برین لە پێکاب دادەگرن و برین حەوشەکەمان دەتەنێتەوە. سەیرترین شتیش ئەوە بوو کە دەبوایە خوێنی رژاوی تاوان، لە پێشچاوی جەللاد بسڕینەوە، تەنها لەبەر ئەوەی تاوانبار بێخەتا و قوربانییەش بێ ناونیشانیی هەڵبژێرێت.

پیکابە بۆرەکە بەرامبەر بە سێیەم دەرگا رایگرت. دوو پەنجەرەی لاکێشەیی کە بە هێڵەگ داپۆشرابوو. دیوارێکی بەرزیش. هیچ دەسڕەنگینییەکی پێوە دیار نەبوو. لە دەرەوەوە ئەگەر سەیری پەنجەرەکانت بکردبایە هیچ شتێکت لێوە دیار نەدەبوو. ئەمە ماڵی دووەممان بوو لە دوای خانووە دەرگا سەوزەکەی قەلاّ. ئێمە رادەکەین و خوێن دوامان دەکەوێت و خوێن دەماندۆزێتەوە. ئیتر کارەسات گوند و شاری بۆ نییە، دوای ئینسانەکان دەکەوێت. رژانی خوێنی باپیرەم تەنها خوێنی پیرەمێردێکی نوورانی، بێ تاوان نەبوو، بەڵکو خوێنی بێ تاوانی بوو و دەرژا. بە خۆڕاییش دەشاردرایەوە. ئەمە بالاّی خوێنێکی بێ ئازار و بێ قرە و بێ بۆڵەبۆڵ بوو. دەکرێ بەم خوێنانە بوترێت، خوێنی ئاسان، یا خوێنی هەرزان، یا خوێنی خۆڕایی. خوێنێک بوو رەگی چووبووە ناخی زەمەن و زەمینێکی رەنگ پەڕیوەوە، لە خاکی مێژوویەکی بێشوێندا رەگهاژوو بوو.

بۆ ئەوەی هەستت بەو خوێنە بکردبایە، دەبوایە رێک و راست بەرامبەری رابوەستیتایە، پەنجەت بۆ درێژ بکردبایە. خوێنێکی بێدەنگ رژایە سەر خاکێکی بێ زەمەنەوە. هەموو پەڕۆپیتاڵە ئاڵ هەڵگەڕاوەکانیان کردە تۆپەڵی سیپاڵ و فڕێیان دایە قورگی بێرچوونەوە. چ شاگەشکەیە جەللاد! دایکم ئەو پەڕۆپیتالاّنەی کردە کوونێکەوە کە هیچ دوارۆژێکی بۆ نەبێت، هیچ ئاسۆیەکی لێوە دیار نەبێت. ئا ئەمە مێژووی برینێکی بێ ئازار بوو کە بە سانایی رۆح دەکاتە تۆپەڵێک گڕ و فرێی دەداتە ئەو پەڕی هەست و شعوور و نەستەکانی ئینسانەوە. بێ ئازار چونکە، دەنگی کپکراو برینێکی بێ ئازارە. خوێن ئەگەر بێت و توانای گۆرانی وتنی نەبێت، دەبێت بەلایەن کەم بهێڵن بێتە زمان. خوێنی باپیرەم خوێنێکی لاڵ بوو.

دەبێ ئەوەش بوەترێت کە ترس و لەرزەکانی حەوشەی قوتابخانە گەیشتبوونە کووچە کۆڵانەکان، هەر ترس بوو کە رۆحلەبەرەکانی بێدەنگ کردبوو. ترسنانەوە بە پێی بەرنامەی تایبەتی بەڕێوە دەچوو. بەڵام رۆحە پێگەیشتووەکان، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بێدەنگ بووبێتن، ئەوە لە سووچێکدا، لە دووتۆی لەشدا، بێ ئامان ئۆقرەیان گرتووە و بەڵام وردە وردە بوڕکانەکانیان جۆش دەدەن. بە نیسبەت ئەو رۆحانەوە ئەم برینە هەروا نا بێت بە ئاسانی زیندەچاڵ کرێت.

بێگومان ئەم فشارانە لە گیانمان پەنگی دەخواردەوە، پەنگی دەخواردەوە و دەبووە دەریاچەیەکی نوستوو. نوستوو بەڵام خەونی دەبینی.

گەیشتبوومە بەر دەرگا: دەرگا گۆڕاو، پەنجەرە هەڵتەکاو، دیوار بە قوڕ سواغدراو، بەڵام هەر بە هەمان زمانی پێشوو، نەیهێشت زمانم بپژێ و خۆی هاتە دوو: چۆن باپیرەیان بەوجۆرە بریندار کرد؟ ئەم برینە تا دوا رۆژی دوایی هەر بە دەستییەوە دەتلایەوە. وەکو شایەدێک هەمیشە دەستی هەڵدبڕی. خەڵکیش بێدەنگ بوونایەوە، ئەوە دەهاتە زمان.

کەواو سەڵتە و فەقێیانەکەی وا لێرەن. رۆحی ئەو خوێنە بێ تاوانە زیندووە و باسی حەکایەتی خۆی بەو پەڕی رەوانبێژییەوە دەکات. غەمگین نییە، چونکە ئێستا لە مێژووی برین تێدەگا. رەنگبێت مۆرانە سەڵتەکەی کرۆژتبێت، رەنگە دەرپێیەکەی رەنگی خاکییان هەڵگرتبێت، بەڵام بۆن و بەرامەکەی ون نابن.

دەستم بۆ دەرگاکە برد، ئاسنێکی ساردەوە بوو بوو. گەچی قەد دیوارەکان فێنک و پەردە سپییەکانی پشت پەنجەرەکەش، دەلەرانەوە... دەلەرانەوە و زیاتریش دەستیان بە لەرانەوە کرد. وردە وردە گوێم لە خڕەی سمی وڵاغ دەبوو. ئەسپ بوون، سوراچاکبوون، بە لەشکرێکی زەمانی کۆن دەچوو. کاتێک ئاوڕم دایەوە دە دوانزە سوارچاک لە پشتمەوە راوەستابوون. عەبای رەشیان لە کۆڵ، هەنییە گرژ و لەش باریک، چەناگە تیژ، یەکێکیان شوێن برینێکی چاکبووەوە بە تەوێڵییەوە بوو. هەر هەموویان شمشێریان بە

دەستەوە بوو و خۆیان بۆ راوەشاندنی ئامادە کردبوو. ئەوانەی پشتەوە دەیانلووراند و لە پشتی ئەوانەی راوەستابوون، بەرەو کۆلانەکانی ئەو دیو هەلمەتیان برد. تەپۆتۆزێکی زۆریان لە کۆلانەکە هەلساند، تێکەلی تیشکی هەتاو بوون. هێشتا بە تەواوی تەپوتۆزەکە دانەمرکابووەوە، دە دوانزە سواری دیکە، ئالای رەش و سەوزیان بەرزکردبووەوە، بە خەتی سەیر شتی لەسەر نووسرا بوو، بە من نەدەخوێندرایەوە.

یەکێکیان، گورج لە سەر ئەسپەکەی دابەزیی و بە تورەییەوە بەرەو رووی من هات. چەناگەی کەمێک بەرزکردەوە و پێی وتم: *"چ دەکەی بەرامبەر مالەکەی من، هەی گەمژە؟"* منیش بە بێ هیچ خۆ تیکدانێک: *"ئێرە کاتی خۆی مالی ئێمە بوو، منیش ماوەیەک نییە گەڕاومەتەوە، لە دوێنێیەوە لە مالەکەی خۆمان دەگەڕێم. بە باشی نازانم لە چ گەڕەکێک بوو"*. وەک ئەوەی خۆی بۆ گوێگرتن لە وەلامەکەی من ئامادە نەکردبێت، گەڕایەوە سەر ئەسپەکەی و رووی کردە من و بە تەوسێکەوە: "تا زووتر ئاوا بێت، درەنگە". کە ئەمەی وت، گەڕابووە سەر پشتی ئەسپەکەی. رەشمەکەی بەرز کردەوە و لە گەل ئەوانەی دەوروبەری تێیان تەقاند تا بگەنە سوارچاکەکانی دی. هەر دوای ئەوان، دە دوانزە سوارچاکی دی، دوایان کەوتن و عەباکانیان لە پشتەوە وەکو پەڕەشووت دەکرایەوە. دەتوی هەندە نابات بال دەگرن. تا ماوەیەکیش خڕە سم لە سەر قیری کۆلانەکان خرمەی دەهات. بێدەنگییەکی دی گەرایەوە کۆلان.

لە گەل دامرکاندنەوە تەپوتۆزەکە، خانووەکانی ئەوبەرەوە دەردەکەوتن. مالی پەریزاد و مالی نازداری ئەحمەدە سیسە، مالی حاجی تەمر، ئەوەی هەمیشە دوردونگ و حەزی لە چارەی مندالان نەدەکرد. سەیری ئەولاترم دەکرد، ئەمە مالی مام عەزیزە، سمایل و برایمی کوڕیان، دایکیان خەلکی سلێمانی بوو، ئەو کات وشەی سلێمانی لە لای ئێمەی مندال سەدایەکی هەبوو واماندەزانی لە بن دونیایە. مالەکەی دیکە مالی موفیدە، موفیدە قەلەو، ئەویتر مالی جوبرائیلە و دوا مالێش مالی قەدرییەی مامانە. ئیتر چەند مالێکی

تر دێت کە لە ئێمەوە دوور بوون عەرەسە و خانووەکانی شەریکەی لە یەک جیا دەکردەوە، بەڵام ماڵی حەمید چکچکەی سیحرباز دیاریی ترین ماڵی ئەو ریزە بوو.

کاتێک بە تەواوی غوبارەکە نیشتبووەوە، چوومە ناوەند کۆڵانەکە. سەیری راست و چەپم کرد و حەزم دەکرد وەکو جاری جاران، مناڵانە دانیشم. دەشمزانی حەزێکی مناڵانەیە و ئێستا هیچ بەهایەکی نییە. بەڵام حەزێک بوو دەمیگەڕاندە دوواوە. هی ئەو ساڵانەی کا تازە خەریک بوو لاسک و گەڵاکانی منداڵیی لە لەشم دەبوونەوە و هەرزەکارانە دەمڕوانییە دونیا. دونیای من "ئیمان" ناوێک بوو. کچی قەدرییەی مامان. چاوەکانی وەکو زەمەڕەد دەدرەوشانەوە و قژە کورتە خاوەکەی، گۆنا چاڵەکەی، قەد شیرینەکەی. لەسەر هەموویەوە مینیجۆبە گوڵدارەکەی. لە پەنا دیوارەکە رادەوستام و بە پێشمدا تێدەپەڕی. لە رێگای ئەوەوە جوانیی هەموو دونیام دەبینی. لە بەر سێبەرەکە دادەنیشتم، چاوەڕوان بووم تا دەهات.

جوانیی ئیمان جوانییەکی روەکانەی هەبوو، روەکێکی نامۆ، رەگو ریشاڵەکانی لە لەشی مندا بوون. لە ناو چێژ و ئازاردا ئاویان دەخواردەوە.

چیرۆکی ئەم ئازارە شەنگە دەگەڕێتەوە بۆ بەسەرهاتێک، رەنگیشە خەیاڵێکی خولقێنەر دروستی کردبێت! چیرۆکێکی زۆر سەرەتاییە، بەڵام دروستکەرە. رەنگە ئەو چیرۆک و بەسەرهاتە سەرەتاییانە کارەکتەری و تەبعی ئایندەی ئینسان دیاریی بکەن. چیرۆکێکە هەندەی رەنگ بەشداریی تیا کردووە، هەندە حەکایەتی تێدا نییە، بۆیە چیرۆکێکی ئیتیباعییە. هێشتا لە گوند بووین، جوانییەکی شارستانی هاتبووە گوند و لە ماڵێک لە ماڵەکان بوو. یەک دوو رۆژ نیشتەجێ بوو. رەنگی کراسەکەی تەنها بە گوڵە هەنار دەچوو. سوورێکی تێر، بێگەردییەکی رەهای ئاوایی، هێمنیی پەرێزی هەبوو. ئەگەر بە جوانی بیرت لێ بکردبایەتەوە، پرسی ئەوەت لە لا دروست دەبوو: ئایا ئەم بوونەوەرە لە خەڵقێکی هونەرییەوە هاتۆتە نێو ژیان. جا ئەو کاتە، بە دەست ژیانەوە بە حەپەساوییەوە رادەوەستین، رادەمێنین. چونکە ئازادیی

جوولانەوە بێ ئەرکەکانی نابنە سەبووری بۆ ئێمەی گڕگرتوو، بەڵکو ڕۆحمانیش دەباتە لێواری گڵکۆ. بۆیە لە حەوانەوەیەکی ڕاستەقینە دەگەڕێین. دەبینە ڕێبواری نێوان واقیع و هونەر؟

ڕەنگیشە ئەم چیرۆکەی من خەون بووبێت. چونکە یەک دوو جار پرسم لە دایکم کردووە ئایا فلانە شتت دێتەوە یاد کاتێک لە گوندە سووتاوەکانی ناوچەی شوان بووین، دایکمیش وەڵامی دەدایە، کوڕم ئەمە خەونە بینیوتە. خەون ئەو یارمەتییەمان دەدات کە بە ئاسانی جیگۆڕکێ لە نێوان واقیع و هونەر دا بکەین. هەندێ ئینتیباع لە ناو دەچن و هەندێکی دیش تا مردن لە گەڵمانن. ڕەنگە ئەو چیرۆکە ئینتیباعییە یەکێک بووبێت لەو چیرۆکانە. ئەم ڕەنگە هەر جارەو لە ڕێگای سیحری هەتاوە تۆنێکی جیاواز وەردەگرێت. بە پێی یاساو دەستووری خۆی، ڕەنگەکانی ژیانمان بۆ شیتەڵ دەکات. ئەو جوانییەی کە باسی دەکەم، جوانییەک بوو کە بە سەر مەوجی ڕەشاییەوە بەرەو ڕوومان دەهات. دەرژایە حەوزە شینەکانی لەززتەوە. گڕی دەگرت حەز و شێتانە سەیری دونیامان دەکرد!

لە ناوەند کۆڵان ڕاوەستابووم و گشت ئەو حەکایەتانە، بە ڕاست و ناڕاستیانەوە ئاوەژووی ناوەوەم دەبوون. دەیاندواندم و دەمدواندن. کۆڵان وەکو حەسارە پانوپۆڕەکانی مێژوو دیکۆرێکی دێرینی دەپۆشی، دێرین وکۆن. کۆڵان لەسەر ئەم دووفاقییە ڕاوەستابوو، بەشێکی دەکەوتە سەر کەناری زەریاییەکی ئاڵی زوڵم، بەشەکەی تریشی لە قەراغ هێمنییەکی حەواوە ڕاکشابوو، وەک بڵێی سەری نابووە سەر کانییەکانی لەززەت. لەشێکە لە دوو لاوە ڕەگەزی جیاواز لێ دادەچۆڕێت: خوێنی تاوان و ئاڵیی و جوانیی گوڵێک کە خەونی هەنار دروستی کردووە. ناوەندی ئەم کۆڵانە دوو ڕێیانێکە، چەقی لێکدادانی شتە دژوار و لەیەکچووەکانە. ئا لەم قوژبنە برووسکە لە دایکدەبێت و ئا لە کەنارەش باوێشک زیندەچاڵ دەکرێت؛ ئەوبەر عەرەسەیە، کەلاوە زێڕینەکانی مێژووە و ئەمبەریش خانووە هیس لەسەر نیشتووەکانی بڵێسە هەمیشەییەکانی باوەگوڕگوڕە. ئا لەم دەرگایەوە خوێنی

تاوان فیچقەی دەکرد، ئا لێرەوەش حەزێکی شێتانە سەریهەڵدا؛ تاکو ئێستاش بە کۆڵەگەکانی بێهوودەییدا هەڵدەگژێ.

تەنها هەر دوو رۆژە هاتوومەوە ئەم شارە، بەڵام دوو سەدە بەرۆکم دەگرن. کات وەکو خوڕە شی دەبێتەوە، دەئاوسێ، دەکشێ، وەک نەمامێکی بەهاریش پەلوپۆ دەهاوێژێت... لە کۆتاییشدا دەبێتە هەڵم و ئاسۆ داگیر دەکات. کاتێکیش سەیری ناولەپم دەکەم، لە ئاوێنە سەیری بەژن و قووڵایی چاوەکانم دەکەم، ئەوەم لە بیر دەچێتەوە کە تەمەنم تەنها سی و پێنجساڵە. تەنها سی و پێنجساڵ ژیاوم. راستە کات هەمیشە هەر بە ساڵ و مانگ و رۆژ ناپێورێت، پێوەری راستەقینەی کات چرکەیەکە هەندێجار باوەش لە ئەبەدییەت دەدات.

دیارە ئەم بەسەرهاتانە بە وشە باس ناکرێن! هەر وشەشمان هەیە بۆ باسکردن! بەڵام هەندێجار وشەیەک هەموو مێژوو داگیردەکات، رەگەکانیشی وا لە تاریکییەکانی جەستەدان.

ئەم کۆڵانە سەدای چیرۆک و بەسەرهاتی تیایە. ئەگەر بێت و کامیرایەکت پێ بێت و بەرامبەر بەو پەنجەرەیە رایگریت، ئینجا وردە وردە بچیتە سەر دەرگاکە و لەوێوە وەکو پشیلە بە سەر دیوارکەدا هەڵگژێی تا دەگەیتە سەر ئەو کاغەز و نایلۆنانەی کە ئالۆزکاونەتە نێو تێلی کارەبایەکە، ئەو دەزووڵە تێکچڕژاوانەی کۆلارەکانە بانگی عەدەسەی کامێرایە دەکەن و لە پشتەوە ئاسمان قووڵ، لە دووڕ را شین دەچێتەوە.

ئا لەو کاتە بیرم لە پرۆژەی ئەم نووسینە کردەوە. لە بیرکردنەوەدا بووم کابرایەکی باریکەڵانەی رەقەڵانە، بە خێرایی بە تەنیشتمدا تێپەڕی. ئەوە خۆی بوو! هەمان ئەو زەلامەی کە کاتی خۆی چێشتەنگاوان دەهات و شووشەی بەتاڵی دەکڕی. دەنگێکی ساف و بێگرێی هەبوو، بە تورکمانی و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: "قەرە شووشێ، بەیاز شوشێێی کیمدەوار؟" واتە "کێ شووشەی رەش و سپی هەیە؟" کۆتایی وشەی شووشەی لە نێوان "و" و "ێ" بە جۆرێک درێژ دەکردەوە و "وار"ەکەی کۆتاییشی هەند درێژ دەکردەوە،

دەتوت قۆریات دەخوێنێت. ئەمە ئاوازێکی زۆر ئاشنا بوو، هەموو هەفتەیەک ئێمەی منداڵ بە بێ ئەوەی گوێی لێبگرین، گوێمان لێی دەبوو. زەمبیلەیەکی شۆڕ بە شانیدا شۆڕ دەکردەوە، دیژداشەیەکی رەنگ تێری لەبەر دەکرد و سەریشی بە کڵاو مێزەرێکی تا بڵێی تورکمانی، توند توند دەبەستەوە. کڵاو قوت وەک گومەزەکانی کەرکووک. دەموچاوێکی رەقەڵانە، لووت باریک. بینینی ئەو کابرایە دڵخۆشییەکی پێ بەخشیم. قەد بیرم نەکردبووە کە رێککەوتی وا رۆژێک لە رۆژان دروست بێت. ئەم دەنگە ئاشنایە مەودای نێوان کاتەکانی بە تەواوی هەڵدەوەشاندەوە. بە خێرایی وەکو جاران، لە یەک دوو چرکەدا لە پێشچاوان ون بوو. سست و شەکەت دیار بوو. دەنگی کەرخ و سمێڵەکانی بە تەواوی وەک جاران لوول، بەڵام سپی ببوو. بە چاو دوای کەوتم تا لە پێش چاوم ئاوا بوو.

وەک بڵێی ئەم کۆڵانە بە هێزێکی نامۆ بەرەوخۆی رامدەکێشێت. منیش لە شوێنێک دەگەڕام کە بمناسێتەوە، لە دەنگێ دەگەڕام لە یەکێک لەو ماڵانەوە بەرزبێتەوە بێت یەخەم بگرێت و پێم بڵێت بۆچی کاتی خۆی بە پێی پێویست باسی برینی هەراشی باپیرەمان نەکرد؟ بۆچی خوێنی باپیرەتان شاردەوە؟ نەتاندەزانی برینی باپیرە هەموو رۆژێک هەراشتر و دەم فراوانتر و گەورەتر دەبێت؟

راستە باپیرە بەو برینەوە دەتلایەوە. چەندین نەخۆشخانەی پێکرا. برینەکەی وەکو شایەدێک دەیویست هەموو رۆژێک ئابرووی بێدەنگیی بەرێت. رۆژگار هات و رۆژگار چوو. برینەکەی بوو بە رەمزێکی زیندووی گوندەکانی کاولەسوار و بیلاڵک و پیرەئەسفهان کارێزە و یارمجە و لە سەر هەمووشێیەوە، گوندەکەی خۆی، زەردک.

کاتێکیش هەواڵ دەنێرنە شێخەکەی تولکی، یاشێخی کەنفت، ریشە سپییەکەی تا قەراغ گۆڕ شۆڕببووەوە، پشت کۆم، برۆکانی لەملاوئەولاوە لوول ببوو. لە گەڵ نوێژی بەیانیان، هەموو رۆژێک چاوی تێر کل دەکرد. عەبایەکی سەوزی دەدایە سەرشان، دەیانوت عەبای خدری زیندەیە. هەموو

کەس لە سەر ئەوە ریکبوون، کە یاشێخ خاوەن کەرامات و بەڵکو تواناکانیشی دەگاتە ئاستی موجیزە. دوای ئەوەی هەواڵ دەگاتە یاشێخ، رۆژی دوایی بە دوای باپیرەما دەنێرن، چونکە باپیرە چووبووە خەوی و وتبووی "هیچ نییە، بۆ خاتری غەوسی گەیلانی چاک دەبێتەوە. چاکی دەکەمەوە، پەنا بە خوا". بەڵام مەرجی بۆ عیلاجەکان دانابوو. هەندێک لە مەرجەکان ماددی بوون و پەیاکردنیان هەندە سەرئێشەی دروست نەدەکرد، مەرجە رۆحانییەکانیش مەگەر هەر خۆی بزانێت چی بوون.

مەرجە ماددیەکانیان ئامادە کرد: لە چەند جۆرە گیاوگۆڵێکی تایبەتی کوێستانەکان بوو. هەر گیایەکیش دەبوایە رۆژێکی تایبەتی بۆ دیاریی بکرابایە، لاسک و گەڵاکانی بە جیا هیشک کرابانەوە، رەگی هەندێکی لە ناوە هاوەن بکوترایە، پاشان لە گەڵ ئێسقانی سوورە ماسییەکانی زێی گەورە، ئەگەر هی زێی گەورەش دەسنەکەوت، ئەوە زێی بچووکمان هەیە، پاشان هەموو پێکەوە دەکوترێن و تێکەڵی رۆنی زەیتوون دەکرێن و لە گەڵ مازوودا دەهاردرێنەوە. ئەم گیراوەیە وەکو مەلحەمێکی لیدێت. هەموو سەرلەبەیانیەک، پێش هەتاو هەڵاتن، بەرامبەر بە ئەستێرەی سیوەیل، لە سەر برینەکەی دانێن. ئەم کردەیە سەرەتا سێ جار لە مانگی یەکەم و پاشان سێ رۆژ جارێ، بۆ ماوەی چل رۆژ.

مەرجە رۆحانییەکانیش، ئەمەی لای خوارەوە بوون. پێویست دەکات، نەخۆش یا بریندار، پاش ئەوەی کە چاک دەبێتەوە، پەیمان و وەعد بداتە یاشێخ کە دەبێتە یەکێک لە موریدە گوێڕایەڵەکانی و ئیتر لە ئیتاعەی دەرناچێت و دەبێت ملکەچی ئەو بێت تا رۆژی قیامەت.

ئەم دوو مەرجەیان خستە پێش باپیرەم. سەیرێکی دەروبەرەکەی خۆی کرد و پێی دەچوو لە ناخی دڵی خۆیەوە بڵێت "لا حول ولا قوه الا بالله". قایل بوو. دەسەڵات چییە!

عیلاجە ماددیەکان کۆکرانەوە وگیراوەکە یا با بڵێن مەلحەمەکە حازر کرا و بە وردی چاودێری کات و ساتەکانی کرا و کاتێکی تەواویش تێپەڕی بە

بێ ئەوەی هەست بە چاکبوونەوە بکات. سێ مانگ و چوار مانگ تێپەڕێ و قەد لەوەپێش هەندە دیققەتی ئەستێرەی سیوەیلیش نەدرابوو. ئەم ئەستێرەیە بۆ ماوەی چوار مانگ ببووە ئەندامێکی دیکەی خێزانەکە. سیوەیل دەرکەوت و ئیمرۆ هەورە و سیوەیل دیار نییە، سیوەیل ون بوو. رستەی لەم بابەتە چەندین جار دەوتران و دەوترانەوە.

دوا قەناعەتیان لە لا دروست بوو: ئەویش ئەوە بوو کە حاجی لە ناخی دڵییەوە حەزی بەوە نەبووە کە دوای چاکبوونەوە ببێتە موریدێکی موخلیسی یاشێخ. دەبێت ئەوەش بوترێت کە باوباپیرانی ئێمە قەد دڵیان بە شێخ و مەشایەخ نەدەکرایەوە. بەڵکو زۆر بە پێچەوانەوە، برا گەورەکەی باپیرەم هەر زوو چەکەرەکانی مەدەنییەت لە مێشکی دەپشکوێ. هەر لە سەردەمی هەرزەکاریشەوە دەچێتە پاڵ لەشکری عوسمانی. هەرزەکارێکی گوندەکانی شوان و ساڵەیی بگاتە لەشکری عوسمانی خۆی لە خۆی دا رووداێکە دەبێت چەندین هەڵوێستەی لەسەر بکرێت.

وەک دەگێڕنەوە و دەڵێن زۆر کەیفی بە سیاسەت و هەڵسوکەوتی تورکە لاوەکان نەدەکرایەوە و هەر لە سەرەتاکانی جەنگیشدا، لەو کاتانەی کە هێشتا بە روونی ستراتیژییەتی عوسمانییەکان بە تەواوی روون نەبووبووەوە؛ هێشتا نەیاندەزانی هاوپەیمانێتی لە گەڵ کێ دروست دەکەن. ئا لەو کاتانەدا بوو جەمال پاشا ئارەزووی ئەوەی هەبوو کە ئیمراتۆرییەتەکەی لە فەرەنسییەکان نزیک کاتەوە. بەو بۆنەیەوەش، وەفدێک ئامادە دەکەن و زەمینەی ئەو سەفەرە مێژووە خۆش دەکەن. وەک دەوترێت برا گەورەی باپیرەم لە هەمان پاپۆڕدا دەبێت و یاوەریی وەفدەکە دەکات. بەڵام سیفەت وئەرکی تەواوی پێنازانین.

نازانین! ئەوەند هەیە، ئەو هەست دەکات کە عوسمانییەکان لە ئەڵمانییەکان نزیک دەبنەوە و دەبنە هاوپەیمانی ئەوان، دەزانێت خاکەکەی ئەویش دابەش دەکرێت. وەک دەڵێن زۆر شتی دیکەی تریشی دەزانی. رەنگە ئەم هەموو زانیاریانە بخرێنە گومانەوە، بەڵام ئەوەی جێی گومان نەبوو برا

گەورەکەی باپیرەم لە گەڵ وەفدەکە گەیشتە فەرەنسا و ئیتر جارێکی دی پێ نانێتەوە سەر خاکی کوردستان.

لەو فەترەیە تەنها هەر نامەیەکی ناردبوو، نامەیەک و بەس! لەو نامەیەدا باسی ئەوەی کردبوو چۆن گەیشتبووە فەرەنسا و چۆن فێری فەرەنسی بووەو، چۆن هەستی کردووە لە ناو کۆمەڵگەی فەرەنیس خەریکە دەتوێتەوە. ئەم نامەیە تاکو زەمانی حەرەس قەمییەکان مابوو، ئەو نامەیە و چەندین شتی بەکەڵکی دیکە، لە ناو سنووقێکیلە تەختە دروستکراوی شینی ئاچووغ هەڵگیرابوو. ئیتر ئەو رۆژە تاریکانە، چارەنووسی ئەو نامەیە دەکەنە سووتەمەنی و چەندین لاپەڕەی بەکەڵکی مێژووی ئەو خێزانە فڕێ دەدرێتە ناو قورگی بیرچوونەوەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو نامەیە چەندین جار خوێندرابووەوە، نەنکم بەو نەخوێندەوارییە، چەند پەرەگرافێکی ئەزبەر کردبوو، چونکە تا زەمانی حەرەس قەومیش، هەر کاتێک مێوانێکی خزم بهاتبایە، سنووقی تاینیان دەردەهێنا و نامەکەیان لە زەرفە هەڵدەپچڕی و بە دەنگی بەرز بۆ دانیشتوان دەخوێندرایەوە.

ئەم بەسەرهاتانەی لای خوارەوە ناوەرۆکی نامەکە بوو: دوای ئەوەی دەبێتە جێی باوەڕ و سیقەی قۆماندانەکانی لەشکر، نەک هەر پلەی و پایەی بەرز دەکەنەوە بەڵکو دەیەکەنە یەکێک لە ئەندامانی وەفدەکەی کە بۆ ولاتی فەرەنسا تەیار کرابوو. سەفەرێکی دەریایی سەرنجڕاکێش بە نیسبەت یەکێکەوە هەموو منداڵی لە نێو پەرێز و دەشتاییەکانی حەسار مەحەتە بردبیتە سەر. لە دەریای ئیجەوە تا مارسای. خۆی لە وەفدەکە دەدزێتەوە و خۆی تەسلیمی دەسەڵاتی فەرەنسی دەکات. هەر لە مارسای داوای مافی پەناهەندێتی دەکات. دڵی خەتەرەی کردبوو کە چۆن لەشکری عوسمانی لەو جەنگەدا شکست دەهێنێت و چۆن وڵاتەکەی ئەویش پارچەپارچە دەکرێت. ئیتر دڵی بینایی نادات کە جارێکی دی بگەڕێتەوە وڵاتە خاپوور بووەکەی. کاتێکیش سەیری ئەرشیفەکانی وەزارەتی ناوخۆی فەرەنسا دەکرێت: یەکەم پەناهەندەی کورد لە کۆماری فەرەنسا.

فەرەنسییەکان داواکارییەکەی قبووڵ دەکەن. هەندەش نابات رەوانەی شارێکی رۆژهەڵاتی فەرەنسای دەکەن. دەڵێن لەوێ کچێکی ئەرمەنی دەهێنێت و دوو منداڵی لێی دەبێت. پاش نیوەڕوانی یەکشەمووان، بە قەراغ رووباری "دوو" دا پیاسە دەکەن و تەنانەت هەندێ لە شیعرەکانی لامارتین-یش لەبەر دەکات. بە تایبەت شیعرە بە ناوبانگەکەی کە بۆ دەریاچەیەکی هەڵبەستووە.

من دێتەوە یادم کە زۆرجار نەنکم باسی شوبراکەی بکردبایە، هۆن هۆن فرمێسک بە گۆنا چرچولۆچەکەی دەهاتە خوارەوە و دەیدایە پڕمەی گریان و دەیوت: " *ئێستا لەو بەستەڵەکانە رەق بۆتەوە*!".

جا سەرەرای ئەوەی کە باپیرەم کەشیدەی لەسەربوو و خواناس و دەسبڵاو بوو، بەڵام نوشتە و بسک هۆنینەوە و کلرێژکردنی چاو و عەباشۆڕکردنەوەی شێخانی بەدڵ نەبوو. ئەوێک هەمیشە شانازی بەوەوە کردبێت کە برا گەورەکەی لە گەڵ جەماڵ پاشادا دانیشتبێت و گەیشتبێتە قوتبی شیمالی، مەبەستیان لە فەرەنسا بوو، چۆن دەچێتە ژێر رکێفی ئەو هایوهووتانەی کە دەگەرایەوە بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئاین.

بەڵام سەرەتای ساڵانی حەفتا مزگێنییەکی پەدیدەئامێز بوو بۆ باپیرەم، نەک تەنها بۆ ئەوە بەڵکو بۆ هەموو میللەت. تەنانەت دەروازەیەکیش بوو بەرەو رووی باپیرەم کرایەوە. هەواڵی برینداربوونی باپیرەمیان گەیاندە خودی بارزانی. بارزانی حەکیم قەدەرێک بیر دەکاتەوە و خێرا لە مەسەلە گەیشتبوو. وتبووی برینی حاجی خدر برینی هەموومانە. هەروەها وتبووی ئەمە برینی مێژووی ئێمەیە. بۆیە زوو فرمانی دابوو کە بە زووترین کات بگەیەندرێتە نەخۆشخانەکانی ئەودیو. ئەودیویش مەبەست لە تاران بوو. هەر خێرا، کوڕە گەورەکەی خۆی تەیار دا و خەرج و پریاسکەی ئامادە کرد و کاغەزی مۆرکراوی خستە باخەڵ و چەند سەر گیسکێکیان فرۆشت و پارەو خەرجی سەفەر فەراهەم کرا.

سەفەر لە زەردکەوە تا سەردەشت. دوو ناون زۆر پێکدەکەن. وەکو دەڵێن زەردک پاشماوەی کووانووەکانی زەردەشتە. سنوور دەبڕن و ئاودیوی چەم و چیا جوانەکانی ئەو گوندە خەنجیلانەیە دەبن. لە حەمامەکانی خۆیان دەشۆن و تاقێک لە سەردەشت دەمێننەوە. ئیتر لەوێوە بە سواری ماشین تا سنە و لەوێوە ڕێگاکانی تارانیان گرتە بەر. دەگەنە نەخۆشخانە گەورەکەی تاران. گەلێ پزیشکی بە ناوبانگی ئێرانی و خاریجی لە دەوری حاجی خدر کۆ دەبنەوە و پشکنین و ئیشاعە و هەموو تەحلیلێکی پێویستی بۆ ئەنجام دەدرێت. یەکێک لە سستەرەکان خەڵکی پاوە دەبێت، زۆر خاتریان دەگرێت و دەبێتە موتەرجیمیان. خەستەخانەکەی تاران، لەو زەمانە نوێترین ئامێر و چاکترین پزیشکی لێبوو. دوای پانزە ڕۆژ پشکنین و لێکۆڵینەوە و عیلاجی هەموو نەوعە. لە ڕاپۆرتەکەیان ئەمەیان نووسیبوو: "ئەم برینە بە تەواوی چارەسەر ناکرێت، بەڵام کەمێک دەسکاری دەکرێت. ئەو تیلە زمانەی کە نووسابوو بە مەڵاشووەوە دەکرێت ببڕدرێت. ئەو کات دەتوانێت ئەو لەتە زمانەی کە ماوە ئاسانتر بجوولێتەوە و بەڵکو یارمەتی بدات لە نانخواردن. هەروەها هەندێ پیتیش دەتوانێت نوتق بکات، بە تایبەت ئەو پیتانەی کە زمان دەوری سەرەکی تیا نابینێت..."

هەمان ڕێگایان گرتەوە بەر و ئاودیوی ئەمبەر بوونەوە. تاقێکی دی لە سەردەشت ئیتر بە ڕێگای قەڵادزێدا گەڕانەوە دەشتاییەکانی گەرمیان. ماندوو و شەکەتی سەفەر بۆ وڵاتی غەریبایەتی. ئەم گۆڕانکارییانە گوندییەکان زوو ماندوو دەکات. جۆری خواردن و خواردنەوە و شێوەی خەوتن و هتد. لەسەر هەمووشییەوە ناشارەزایی کە ئینسان هەندەی دیکە ماندوو دەکات. گەیشتنەوە گوند و هەموو کەسوکاران لە سەر سەکۆیەکە، بۆ ئێوارە کۆبوونەوە. فانۆسێک و لۆکسێکیش سەر سەکۆکەی بە تەواوی ڕۆشن کردبووەوە. لاکێشەیی لباد و لەسەر لبادەکانیش دۆشەک داندرابوو. منداڵ و ژنەکانیش لە کەنارێکەوە دانیشتبوون. دەبوایە سەرەتا باس لە سەفەرەکە و ڕێگاوبانەکان بە وردی بکرێت. هەموو شتێک بەسەر کرایەوە... باسی

گوندەکانی ئەودیو و حەمامەکانی سەردەشت و لەهجە و شێوەزمانی ئەو دەڤەرە کرا. بە وشەی "وانەکێ" قەدەرێک پێکەنین، چونکە "وانێک" مورردادیفی "هەرامە"ی هەولێریان و "هین"ی کەرکووکییان بوو.

خالّم راپۆرتەکەی بە زارەکی بۆ دانیشتوان باسکرد. هەموو گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئیتر باپیرە لەمە زیاتر چاک نابێتەوە. ئەمە قەدەر و چارەنووسێتی. هەموو ئیتر ملکەچی واقیع بوون. باپیرەش تا جیهانی جێهێشت بە دەست ئەو ئازارە دەتلایەوە. لە راستی ئازاری برینەکە نەبوو، چونکە برینەکە چاکببووەوە، بەڵام ئیفلیجییەکی بۆ دەم و دانەکانی جێهێشتبوو. تا ئەو رۆژەی کۆچی دوایشی کرد بە عەزرەتەوە بوو دوو پاروو نان، نان و بەس بخاتە ژێر دانەکانی و بە کەیفی خۆی بیجوێ تا دەبنەوە هەوێر و ئینجا قووتی بدات. بۆیە ئەو رۆژەی مەرگ، بە خۆی و عەبا رەشەکەیەوە هات، ناولەپی بەسەر برینەکەدا هێنا و بە تەواوی سڕییەوە. مەرگێک بوو وەک دەروازەیەک سەیر دەکرا، خۆی بۆ بێدەسەڵاتیی کردبووەوە. بۆیە هەندێجار بە چاوی بەزەییەوە سەیری ئەو مەرگە دەکرا. بۆ هەندێک ئەو مەرگە تەنها دەرگایەکە ئینسان بەرەو جیهانێکی فراوانتر و فەراحتر و حەواوەتر دەبات. ئیتر لەو بڕوایەش دا بوون کە هەموو ئەو ئازار و شەونخوونییانەی حاجیش دەبنە کەفارەتی هەموو گوناهەکانی و بەهەشتی پانی پەروەدەگاریش دەبێتە دوا بارەگای ئاسوودەیی. ئیتر لە بارەگاکانی بەهەشت هەندە ئێش و ئازارەکانی باپیرە ناکەونە بەر قامچی نەشتەرچی و ئیتر ئەو ئازارانە وەکو سکاڵایەکی ئەبەدی بۆ کەشکەڵانی فەلەک بەرزنابنەوە. بەڵکوە بە پێچەوانەوە جەستە شەکەت و ماندووەکەی دەکەونە خنەخن و بە پاداشتی حەوانەوە و سارێژبوونی هەتاهەتایی دەحەسێتەوە. لە بەر سێبەرە هێمنەکانی لەززەتدا، جارێکی دی رۆحی دەکەوێتەوە بەر شنەباکانی حەسانەوەی ئەبەدی.

ئەو جەستەیەی کە وا بۆ دەساڵ دەچێت، بۆتە بەشێکی نامۆ لە رۆحە فراوانەکەی؛ یەکێک لە دوو شەویلاگەی بە تەواوی هاڕدرا بوو، تیلێکی

تەواوی زمانی وەک ئەوەی بە مەقەس لێکرێتەوە، وا بوو. نەیدەتوانی چیتر وەکو جاران بێتە زمان. بۆیە لەو رۆژەوە گەشەی بە زمان و ئاماژەکانی چاوانی دەدا. هەندەی دیکە خۆی بە تەعبیر و دەربڕین دەوڵەمەند دەکرد. هەر روانینێک ئاماژەیەک بوو دەیان واتا و مانای پەنهانی لێوە دەپڕژا.

لە گەرووییەوە یەک دوو دەنگ دەزا، تا دەگەیشتە ئێمە هیچی ئەوتۆی لێوە نەدەما تا هەموو کەسێک وەک یەک لێی تێگا. لەو سی و پێنج دەنگەی کە زمانی کوردی پێکدەهێنێت، ئەو بە زەحمەت نیوەشی پێ نەدوترا؛ بە تایبەت ئەو پیتانەی کە زمان رۆڵی سەرەکی تیا دەبینی. لە خۆڕایی نییە نێوان زمانی قسەکردن و زمانی ئۆرگانیک تەنها هەر یەک وشەمان هەیە.

ئەوانەی لە دەوری حاجی بوون، بە تایبەت نەنکم، بە تێپەڕینی کات شارەزای ئەو نێوزمانە بوو و ئیتر لە خەڵکی دیکە زیاتر ئاشنای بوو. بەڵام کاتێک یەکێکی غەریب و نەناسیاو بهاتبایە، ئەوە دەبوایە تەرجەمەی کوردی بۆ کوردی بکرابایە. نەنکم هەمیشە، کوڕ ببووەوە بە دەوری ئەودا دەهات. پەلوولە و پیرخەنی بۆ لێدەنا. دوو خواردنی سەرەکی ئەو بوون. چونکە لە رۆژی بریندارکردنەکەوەیەوە، ئیتر قاپوقاچاغ و کاسە و کەوچکی ئەو لە رەحەتییەک و سۆندەیەکی پلاستیکی پێکهاتبوو. ئەگەریش بچووبایە بۆ هەر لایەک، رەحەتی و سۆندەکەیان بۆ دەپێچییەوە و دەیانخستە خەرجێکەوە. لە کاتی "نانخوارد" کە ئیتر بۆ باپیرەم ئیستیعارەیەکی تەواو بوو، ئەوە سۆندەکەیان لە رێی دەمیەوە بۆ گەرووی شۆڕ دەکردەوە ئیتر لیکاو بە لێوەکانییەوە شۆڕدەبوونەوە. شۆربە و پیرخەنیەکانیان بە کەوچک دەکردە دەمی رەحەتییەکەو ئیتر بە گەرووی شۆڕ دەبووەوە. هەمیشە بە پەرۆیەک دەبوایە بێوچان لیکی شۆڕبووەوە بسڕێتەوە.

نان لە گوندییەک قەدەغە بکرێت، وەکو ئەوەیە گەورەترین سزای بەسەردا سەپێنرانێت. ماوەیەکی یەکجار زۆربوو نانی نەخواردبوو. نان بە هەموو مانای وشە. بۆیە نانی دەگرتە دەست و بۆنی دەکرد. نان بۆ جووتیار و گوندیان، زیاتر لە مانا رووتەکەی هەڵدەگرێت. نان بەشێکی دانەبڕاوەیە لە

جیهان و ئەتمۆسفێری ئەوان. لە هەمان کاتدا جیهانی ناوەوە و جیهانی دەرەوەیان پێکدەهێنێت. بۆنی نان، بۆنی رەنگەکانە بۆ یەکێکی وەکو ئەو، هەر لە سەوزێکی قەرسیلیی تێرەوە تا وردە وردە دەبێتە رەنگی زێڕین؛ هەر لە رەنگی گەنمییەوە تا رەنگی سپییەکی ئاردین. پاشان بۆنی ئارد کە تێکەڵی ئاوێکی شلەتێن دەبێت، واتە بۆنی ژیان، هەر دەڵێی بۆنی تۆماوە. ئینجا دەگاتە بۆنی تەنوورهەڵخستن و نانی برژاو و نانی قەراغ سووتاو تا دەگاتە ئاردی سووتاو کە لە پڕێکدا بۆنێکی تایبەت لە کوونی تەنوورەوە بۆ ئاسمانەکان بەرز دەبێتەوە و تێکەڵی کۆڵان و حەوشە و سەربانەکانی ئاوایی دەبێت. ئێستا تامی ئەو نانە تەنها لە زاکیرە هەرە قووڵەکانی باپیرە زیندووە.

ئێوارەیەک، مەرگ بە خۆی و عەبا رەشەکەی کۆڵی هات و رۆحی باپیرەی بۆ کەشکەڵانی ئاسمان بەرزکردەوە. بۆ ئەو دیوی رەنگی ئەو ئاسمانە بۆرەی کە وەکو سەرقاپی مەنجەڵ، ئەم شارە غەمگینەی داپۆشیوە. ئەم ئاسمانە نەوییە کە دەڵێی هەندە نابات دەرژێتە سەر شار، دەڕمێتە سەر شار و داروديوار پێکەوە خاپوور دەکات. هەموو شتێک دەگەڕێنێتەوە دۆخە سەرەتاییەکانی و هیچ شتێک نامێنێت کە ناوی ژیانی لەسەر نووسرابێت.

ئەو کات دەوترێت، ئا لێرە شتێک هەبوو پێیان دەوت ژیان! بەڵام کەسێک نەماوە باسی کارەساتە گەورەکە بکات!

ئەم کۆڵانە ئێستا بە زمانێکی دی دێتە زمان. زمانێکە لەو دیوی زمانەوە هاتووە. نە دەنگی وشە، نە رەنگی وشە، نە شیکلی وشە دروستیان نەکردووە، بەڵکو زمانێکە بە جۆرێک لە جۆرەکان شۆڕ دەبێتەوە ناخی ئینسانەکان، مەگەر تەنها هەر چاوەکانی باپیرە لە توانایدا هەبێت شیتەڵیان بکات و لێکیان بداتەوە. ئەم زمانە زمانێکی هەند سروشتییە، لە رۆحەوە دەگاتە رۆح.

منیش لە زمانێکی دی دەگەڕام تا بتوانێت ئەم رامانانەم بۆ راڤە کات و بیخاتە سەر شانۆی لەبیرنەچوونەوە. بۆیە بیرم لە مۆزەخانەیەک دەکردەوە کە ئەم گەڕەکە وەکو چۆن هەیە، هەڵگرێت و لە شوێنێک داینێت کە هەموو

کەسێک لە توانایدا بێت، سەری لێدات و زیارەتی بکات. ئەم دەرگا و پەنجەرە و دیوارانە پێویستیان بە قەڵەمی من نییە تا باسی خۆیان بکەن، ئەوان خاوەنی زمان و ژیانی تایبەتی خۆیانن.

ئاوڕ بدرەوەوە خوێنەری خۆشەویست، ئاوەڕ لەو دەرگایە بدەرەوە ئەوە ماڵی ئەحمەدە سیسە، سەیرکە چۆن فریز لە نێوان دیوار و شۆستەکەیان بە عینادی شین بووە. شۆستەکەیان بە مالنچێکی پان و زۆر لووس، چەمەنتۆیەکەیان هەند لووسکردەوە بۆتە ئاوێنە. بە تایبەت کاتێک باران دەباری، ئەو کەسەی بەوێدا تێپەڕبوایە دەبوایە ئاگای لە خۆی بێت، ئەگینا بە سەر قوونی خۆیدا، زرمەی لێهەڵدەستا و دەکەوت. هەموو عەسرانێک، دوو کورسییان دادەنا و خۆی و خێزانەکەی بە بادەی چا بە دەستەوە و دادەنیشتن. کابرایەکی لاواز و سەر رووتاوە بوو، خانەنشینی شەریکەی نەوت بوو. ئەو کەمە قژەشی کە مابووەوە، خاو، بە شانەیەکی دەمباریک، شەقی دەکرد و بە دیوەکەی دیدا شۆڕی دەکردەوە.

ئێمەی منداڵ و شەقی تۆپەکانمان و شەڕەشەقی نێوانمان و جوێنی کوردی و تورکمانی، هێمنی خانەنشینیی ئەوی تێکدەدا، بەڵام ئەو هەمووە لەو کۆڵانە تەسکە جێی دەبووەوە. نازداری خێزانی رەمزی هێمنی و بێدەنگیی و پاکوخاوێنی گەڕەک بوو. عەدنانی کوڕیان هەندە ژیر و بێدەنگ بوو، کوڕانی گەڕەک گومانیانان لە نێرینەیی دەکرد. بە زەحمەت دەزانرا چ روو دەدات لە ناو ماڵیان. زۆر بە پێچەوانەی ماڵی حاجی خالید کە بە رەچەڵەک خەڵکی قەراج بوون، هەر چییەک لە ماڵیان رووی بدایە، ڕیک و راست، دەقاودەق لەیلای کچیان یا تاریقی کوڕیان بۆی باس دەکردین. منیش زۆر فزوولی بووم و حەزم دەکرد بزانم لە پشت دەرگاکان چ روو دەدات.

لە پشت دەرگاکان دەیان حەکایەتی نە نووسرای لێبوو. چونکە هەر خێزانە و خاوەن دابونەرێت و رەوشت و سایکلۆژییەتی تایبەتی خۆیەتی. ئەم کارەکتەر و ئادگارانە سەرنجراکێشن. لە نێوان خۆ بووراندنەوە ژنە تازە گواستراوەکان بۆ ژنە خرپنە دەسبڵاوەکان، ژنانی دەملووس پانتاییەک داگیر

دەکەن کە دەبنە جێی سەرنجی ژنە شەرمۆکەکان، ئەوانەی لە ستایشێک دەگەڕێن تا نرخ و بەهای خۆیان لە لا مسۆگەر بێت. ئەی ئەوانەی کە بە عەزییەکی مەیلەو تەنکەوە، سۆندە بەدەست، پەیژە چەمەنتۆییەکان دەشۆن. ئەو پەیژانەی چاوەڕوانی سەرکەوتنی مێردێکی دووری سەفەری نێوان شارەکانی حیلە و کوفە دەکەن، یا چاوەڕوانی دۆستێکن کە هەرگیزاو هەرگیز نایەت. یا ئەو ژنانەی بە ملکەچییەوە دەڕواننە مێردەکانیان، ناچار ئاوڕێکی بەسۆز لە کۆرپەکانیان دەدەنەوە، تەنها لە چاوی ئەواندا حەز و داهاتوو دەبینن کە بە ئاشکرا تێکەڵ بە وەهم و ئەندێشە دەبێت. لە ژندا مۆرکی خێزان دەردەکەویت و لە خێزانانداا، مۆرکی گەڕەک و لە گەڕەکەکانیشدا مۆرکی شاران. ئەی ئەگینا بۆچی خەسڵەتی شاران یەک لەوی دیکە جیاوازترە؟ ئەگەر هەندێجار، لە ناوچەوانی بێوەژنێکدا کوێرەوەری و نارەزایی ببریقێتەوە، ئەوە ئەو زایەڵە بە ئاسانی ئاوا نابێت.

سیمای ئەم کۆڵانە وەکو ئاوە بە ئاسانی ئاگر مارە دەکات. لە گەڵ تەپوتۆزدا دادەباری و دەبێتە هەڵم، کاتێک گڕەیەک لە باشوورەوە هەڵدەکات. ئەم کۆڵانە شەڕێکە لە نێوا توخم و رەگەزە جیاوازەکان.

دەستم درێژ دەکەم و لەشم وەکو تراوێلکە نوقمی درەوشانەوە دەبێت. تارماییەک بووم گەڕامەوە بەر سێبەرە زیندووەکان، ئەو سێبەرە زۆرانەی کە دیوارە ئەستوورەکان دروستی دەکەن، ئەو سیبەر ملشۆڕانەی بە سڵەمینەوە دەروواننە ئاسمان، ئەوانەی کە بە بێ دیوار هەڵناکەن. قەدەرێک سەیری ئاسمانە بێڕەنگەکەم دەکرد، هەستم دەکرد لە خۆڕا، دوور دەکەوێتەوە. باوتۆزێک خەریکە هەڵدەکات، بۆنی لم و گەندە خۆڵی پێیە، پێش ئەوەی وەکو شالاو بۆ کۆڵانەکان شۆڕ بێتەوە، لە ئاسمانە بێڕەنگەکە دەیان خول دەخوات، بەڵکو سەدان جار. گێژ و وێژ دەبێت، ئینجا وەک شەڕکەرێکی ئەڵقە لە گوێ، ملیۆنان دەنکە غوباری خۆی دەبارێنێت. ئەو باووتۆزە بێمەرجانە کە بە هەوانتە کاغەز و پارچە نایلۆن و پووش و پەلاشی لوول دەدا و بە هەوادا بایانی دەدا، لە سەر ئیقاعێکی جەنازەیی بەرزدەبوونەوە و

نزم دەبوونەوە و پاشانیش وەک شابالّی مەرگێکی کوشندە ڕۆ دەچوونە نێو دەرگا و پەنجەرەکانەوە. هەندەی دیکە ئاسمان ڕەنگی دەپەڕی و بیزاریی دەباراند. پێش ئەوەی کپ ببنەوە، مۆسیقایەکی غەمگین لە هەناویانەوە لە دایکدەبوو و سامناکییەک وەکو توولە مار بە کۆڵان و کووچەکاندا بڵاودەبووەوە.

هەستم دەکرد لە ناو جەرگەی ئەو کابووسانەم کە لە سەرتای پەناهەندبوونم بێوچان دەمبینین. خەون و کابووس ماوەکان لەیەک نزیک دەکەنەوە، ئەو پێنج هەزار کیلۆمەترەی کە شاری ژنێڤی لە کەرکووک جودا دەکردەوە، وەکو دوو ماری ئاشقە ماشقە لێکدەئاڵان، بەڵام نەک بۆ ئەوەی نەوازش لە گەڵ یەکدی بکەن، نەک لەبەر ئەوەی ماچوموچی یەکتر بکەن و یەکتر بلێسنەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ژەهری یەکتر برژێننە لەشی یەکترییەوە. ئەم کابووسانە هەموو کەس نایانبینێت، تەنها ئەوانە دەیانیبینن وڵات بەدەر کراون، یا دوورخراونەتەوە، یا لەبەر هەر هۆیەکی دیاریکراوی دیکە بێت، پردەکانی گەڕانەوەیان لێ خاپوور کراوە. ئەمە تاقە پێوەرە کە ئینسانی پەناهەندە لە هەموو ئینسانێکی ئاسایی دیکە جودا دەکاتەوە. ئەوەی ملۆزمی ئەم کابووسانە سواری پشتی نەبووبێت، ناکرێت پسوولەی پەناهەندێتی بدرێتێ. ئەمە پێوەری ڕاستەقینەیە لە نێوان ئەو کەسانەی کە وڵاتیان بە دەسەسرێک گۆڕییەوە و ئەوانەی لە سەر پردە بەستەڵەکەکان، دەیان شەو و ڕۆژیان کردۆتەوە، وڵاتێکیان دەسناکەوێت بیانگرێتە خۆ. لە نێو ئەو بەرزەخانە دەژێن کە ئەملاو ئەولایان دۆزەخ و جەهەننەمە ساردوسڕەکانە. ئەمانە کابووسن یا هاجیسی گەڕانەوەن؟

ئەو کابووسانە تەواو سایکلۆژییەتی فاشییەت ڕوون دەکەنەوە. ئەو شەوە ساردوسڕانەی کە دەبوونە دوو لەتەوە. قەد لەتێکی بە لەتەکەی دی نەدەچوو. لە پڕێکدا، ڕادەپەڕێی، لیکێکی ڕوون بالیفەکەتی تەڕ کردووە، کاتێکیش زمانت بەر مەڵاشووت دەکەوێت، تامی سووتوویەکی دەکەیت. سووتووی ڕۆحێکی سووتاوە. سەر قورس بووە، جەستە داهێزراوە. بە

تەنها، لە کۆڵانە تاریکەکانی کەرکووک، یا بەغدا، سێبەرێکی زۆریش لە دەورت کۆبۆتەوە. پەناهەندەی، بەڵام بە بێ شناسنامە دەسوڕێیتەوە، شاریش بە جەندرمە و پۆلیس تەنراوە. ئینزیبات ئابلوقەی گەڕەکەکانی داوە. یەکێکیان بەرامبەرت قووت دەبێتەوە. بە زەردەخەنەیەکی زەرد، وەکو پێستی مارمێکلە، بە هێمنی پێت دەڵێت و ریزە دانە شینەکانی دەردەکەون و دەڵێت "*تکایە، شناسنامەکەتان دەرهێنن*" بە ئەدەب و ئوسوڵی وڵاتی دووەم قسەت لە گەڵ دەکات، بەڵام جلوبەرگی هی وڵاتی یەکەمە. تۆش هەناسە بڕکێ دەتگرێ، هەناسەت سوار دەبێت و خۆت ئامادە دەکەیت بۆ راکردن. رادەکەیت، چرێشێکی ئەستوور، ژێر پێڵاوەکانتی بە قیری کۆڵانەکەوە لکاندووە. رادەکەیت و قیرەکە لە پێیەکانت نابێتەوە و ئینزیباتە سمێڵ ئەستوورەکەش راوت دەنێت و دەیەوێت بتگرێت و سواری ئەو زیلانەت بکات کە پڕی لەو نیچیرانەیە کە بە دوایاندا دەگەڕێت. دێیتەوە ئاگا، بۆ چەند چرکەیەک نازانیت لە کوێی. نازانیت لە کوێی! ئای کە دڵخۆش دەبیت کاتێک دەبینیت، بە بێ وەڵام و بە بێ ئیقامە لە ژوورێکی ساردوسڕی کێشوەری باکووری. پڕ بە سینەت هەناسەیەکی قووڵ دەکێشێت و تفێک لە رابردووت دەکەیت.

سەرەتاکانی پەناهەندێتی، ئینسان تووشی بارودۆخی سایکلۆژی توند دەکات. ناسکت دەکات، بێگەرد دەبیت، لە هەندێ شوێن وەکو چۆڕێ ئاو وەختە ببیتە هەڵم. بارستاییت نامێنێت. لە هەندێ شوێن وەکو پارچە نایلۆنێکی شەفاف، هەتاویش هەڵبێت، تۆ سیبەر دروست ناکەیت. لە دۆخی گۆشتی وئێسقانییەوە وەختە بچیتە دۆخی گازییەوە. کاتێک قسە دەکەیت، زۆربەری زۆری خەڵکەکە گوێی لێت نابێت، کاتێک لە ماڵ نایەیتە دەرێ، هیچ کێشەیەک دروست نابێت، بازار بکەیت یا نەء کەس پێت ناڵێت ئەمە کارێکی باشە یا خراپە. شەوان نەخەویت ئاساییە، تا چواری ئێوارەش بنویت هەر ئاساییە. ئەم باردۆخە بۆ خەڵکی وڵات ئازادییە، بەڵام بۆ تۆ دەبێتە بارقورسی و یەک شتت دەوێت ئەویش ببیت. ببیت و بەس. سەرەرای

هەموو گرفتەکان، دەتەوێت ئەو دۆخە شەفافییەوە لە کۆڵت بێتەوە ببیتەوە بە ئینسانە هەر ئاساییەکە. ببێتە جەستەیەک کە سێبەر دروست بکات. گوێت لێ نییە ڕەزاگران دەبیت یا نەء، گرینگ ئەوەیە ببیت و بەس!

ئەم کائینە بێوچان هەوڵ بۆ ئەوە دەدات کە "من"ەکەی خۆی بپارێزێت. هەموو ڕۆژێک لە هەوڵی ئەوە دایە خۆی بە ئاووهەوای نوێ ڕابهێنێت و شەوانیش ملۆزمی کابووس سواری ئەستۆی دەبێت و دەیگەڕێنێتەوە نێو دۆزخێک کە جاران پێیان دەوت نیشتیمان. هەست دەکەن باڵندەیەکی کێوی لە ناخیان دایە. شتێک لە ناخیان دایە ناتوانن دەستی بەسەردا بگرن.

بەڵام ئەم لەحزەیەی کە ئێستا تیای وەستاوم، جیاوازە. لە پڕێکدا ڕانەپەڕم و خۆم بەرامبەر بە دیوارێکی سارد ببینمەوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە خەون دەکات. دەڵێی تێکەڵی وپێکەڵییەکە لە ڕەگەزەکانی خەون و واقیع. خەونە و خەون نییە. کۆڵانێکی بێدەنگ و خوڵبارینێکی موچڕکبەخش، توخمی خەونە، ئەم شارەش دەڵێی لە ژێر دەستمدا خەریکە لە دایکدەبێتەوە واقیعە. تێپەڕبوونی شووشەفرۆشەکە واقیعە، بەڵام وا لە ناکاو لەم ئانوساتەدا هەر بە خەون دەکات. ئەو سوارچاکانە لەم کۆتایی سەدەی بیستەمە هەڵبەتە خەونن، بەڵام ئەو تەپۆتۆزانەی کە نیشتوونەتە سەر شانەکانم واقیعن. ئەم توێژە غوبارەی کە قژە گڤەکەمی داپۆشیوە واقیعە. حەزم دەکرد لەم دوو ڕێیانە ڕزگارم بێت و کەسێک هەبێت بیدوێنم. هەنگاوم هەڵناو و ئاوڕم دایەوە بۆ ئەوەی بزانم کەسێک نابینم. چوومە پەنا دیوارەکە، من و دیوارەکە وەکو یەک وا بووین. سەیری ئەوبەرم کرد، دوکانەکەی مام جەعفەرم بینی، دەرابەکەی تا نیوەی داخرابوو. کاتێک گەیشتمە پێش دوکانەکەی، دەرابەکە بەرز دەبووەوە و مام جەعفەریش لە ژوورەوە بوو. جەمەدانییە خڕە، دامەزراوەکەیم بینی. منی بینی کەمێک سڵەمییەوە، سەرەتا وامزانی نامناسێتەوە، بەڵام بە ئیشارەت بانگی کردم. منیش لێی نزیکبوومەوە و دەستێکم بە هێواشی هەڵبڕی و سڵاوێکم لێی کرد و تی: "*کوڕم کەی هاتیتەوە؟*"

*"ئەوە بۆ سێ هەفتە دەچێت. لە دوێنێیەوە لە کەرکووکم و یەک دوو ڕۆژی دیکە دەبێت بگەڕێمەوە".*

*"ئەی چۆن هاتیتەوە؟"* ئەمەی زۆر بە نزمی وت وەک ئەوەی لە گەڵ کور(ڕ)ێکی خۆی قسە بکات. منیش یەکسەر وتم: *"تەگبیرم کرد".*

ویستم پێی بڵێم ئەرێ ئەم بێدەنگییە چییە وا شاری خامۆش کردووە. نازانم هەستی بەوە کرد کە خەریکم پرسیارێکی وای لێدەکەم، بۆیە پێش ئەوەی پرسیارەکەم بکەم، وەڵامی دامەوە: *"ئەی نازانیت شار وا بار دەکات؟".* بە واقوڕماوییە: " *شار بار دەکات یانی چی؟"*

بێدەنگ، بە دەست هەڵبڕینەوە خواحافیزیم لێکرد و بەردەم دوکانەکەیم جێهێشت و جەمەدانییە توندە بەستراوەکەیم لە چاو ون بوو.

لە جادەکە پەڕیمەوە؛ کەوتمە سەر ئەو جادەیەی کە بەرەو گەڕەکی ئیمام عەبباس دەڕۆیشت. بە دەستی لای ڕاست، ماڵی عەباسە عەجەمە و ماڵی نورە کۆترباز و هەندێ ماڵی تورکمانی دیکە. پاشان گۆڕەپانێکی لاکیشەیی، بە کۆڵانێکی بەرین دەکات، لە سێ لاوە ڕیزە ماڵن و بەرامبەر بە جادەکە، دەرگایەکی ئاسنینی گەورە، کەوتۆتە ناوەندەوە، ئەوە ماڵی مەلا حەسەنی موئەزینە، مەلا حەسەنی کوێریشیان پێ دەوت. بەرامبەر ماڵەکەیان، لەوبەر جادەکە، لە سەر سووچەکە دوکانی تۆپەڵ حەسەن بوو، کاری لەحیمی دەکرد. تاوەی دەسک ترازاو، مەسینەی لوولە خوار، دەستشۆڕی مسی کونبوو، سەماوەری ژەنگلێداو، تەقیلە و تاسی فافۆن، گەلێ شتی دیکە بە دەرەوە و ناوەوەی دوکانەکەیدا هەڵواسرابوون. تۆپەڵ حەسەن بە تەنیا دەژیا. پێیەکی نەبوو، لە جیاتی پێ، تۆپەڵی پەڕۆ دەبینرا. هەر لە دوکانەکەشی دەژیا و بە دارشەقێکیش دەڕۆیشت. گەنجان لە لای ئەو کۆدەبوونەوە. هەمیشە سەرخۆش بوو. هەر دووچای دەرپۆقیو، کڵاوێکی لەسەر دەکرد، جەمەدانییەکەشی بە دیواردا، بە مزمارێکەوە هەڵوسرا بوو.

مەلا حەسەنی موئەزین کوڕێکی هەبوو هاوتەمەنی من بوو، جارێکیان لە گەڵی چووم بۆ کۆترکڕین. تەنها هەر حەفتاوپێنج فلسم پێبوو و لە دڵی

خۆمیش بیرم لە کۆترێکی سپی وەک شیر دەکردەوە. نازانم کێ بوو، وتبووی کە کوڕەکەی مەلا حەسەن یەکێک دەناسێت لە گەڕەکی ئیمام عەباس و کۆترێکی سپی هەیە و دەیفرۆشێت. دە و نیوی بەیانی لە دەرگای ماڵی سەباحم دا، هەندێک لە دەرەوە لەبەر خۆرەتاوەکە چاوەڕێم کرد و وتیان لە ماڵ نییە. دەمەو نیوەڕۆ دۆزیمەوە، سەرەتا زۆر پیاوانە ئارەزووی خۆی نیشاندا، نەمدەزانی دەیەوێت سەرشێتی و سەرچڵیی خۆی ممارەسە بکات. بە تورکمانی پێیم وت: " *یەڵڵا گیداغن، ئیندی یۆدادی*".

هەردووک بێدەنگ، پێکڕا هەنگاومان دەنا، ڕێگای ئیمام عەباسمان گرتبوو، زۆر لە ماڵیانەوە دوور نەبوو. هیچ شتێکی ئەوتۆمان لە ڕێگا باس نەکرد. بەڵام پێی وتم: "*نەنجە پەرەو وار*؟" واتە چەند پارەت پێیە؟

"*یەتمش بێش فلس*"، "*بەخاغن*".

دەڕۆیشتین و هالاوی جادە و کۆڵانە گەرمەکان بەرز دەبووەوە، تۆز و خۆڵیکی زۆریش پەرتوبڵاوببووەوە. کاتێک عارەبانەیەک، یا ئۆتۆمبێلێک تیدەپەڕی هەندەی دیکە تەپوتۆز زیادی دەکرد. عارەقەیەکی زۆریشمان کردبوو و جارناجارێک، بە ناو لەپ عارەقی سەروملم دەسڕی و سەباحیش جار نا جارێک شەقی لەبەردێک دەدا کە پێش پێڵاوەکانی سەغڵەت بکردبایە و بە دەوری خۆی خولێکی دەدا و دەهاتەوە تەنیشت من. جار نا جارێکیش جوێنێکی مزری بە عەلی دەدا، عەلی کۆترفرۆشی هاوڕێی. یەکەم برادەری بینی کە لە کۆڵانەکەی ماڵی عەلییەوە دەهات: " *عالنی گوێردو*؟" کوڕەکە بە بێ ئەوەی رابوستێت و ئاوڕمان لێداتەوە و بە هاوارکردنەوەوە وتی: " *کیم ئۆ کەپەک ئۆغلنی گوێرار*" واتە کێ ئە سەگ کوڕی سەگە دەبینێت.

نەمدەزانی چ کێشەیەک لە نێوان سەباح و عالی هەیە و ئەمە پەیوەندی بە منەوە چییە ؟ ئێمە دەبوایە بچینە ماڵی رەفعەت، چونکە کۆترەکە هی ئەوە و لە ماڵی ئەوانە. بۆیە بە سەباحم وت:

- عالی کیم دی؟

ئەویش بە توڕەییەوە شەقێکی دیکەی لەبەردێک هەڵدا و خۆشی لەگەڵی هەڵبەزییەوە، وەکو ئەوەی لە سەر ئیسپرینگێک بێت و بە بێ ئەوەی سەیرم بکات:

- قوشەکە عالی یاندادی. واتە کۆترەکەی لە لای عەلی-یە.

نەمدەزانی سەری ئەم مووە دەمباتەوە سەر چ مەنجەڵە ماستێکی گەنیو! لە ماڵی ڕەفعەت نزیک دەبووینەوە و سەباح سەیرێکی بانخانووی کرد و شیڕاندی:

- ڕەفعەت، ڕەفعەت.

سەرێکی خڕی پاک تاشراو لە سەر ستارەکەوە شۆڕ بووەوە و وتی:

- بیر دەقە ئابی.

سەباح هەمان پرسیاری دووبارە کردەوە، بەڵام سەرەکە بە خێرایی دیار نەما. هەندەی نەبرد دەرگاکە کرایەوە و یەک دوو پەیژە هاتە خوارەوە و کیسەکەی دایە دەست سەباح. یەک دوو کون لە کیسەکە کرابوو. ڕەفعەت بە سەباحی وت:

- نەنجاسی وار؟

ئەویش یەکسەر لێوێکی بە زمان گەست و من وەڵامم دایە:

- یەتمش بێش فلس.

بەتوڕەییەوە کیسەکەی بۆ درێژکردم ومنیش پارەکەم خستە چنگییەوە و ئەویش بە بێ ئاوڕ دانەوە سەر پەیژەکان کەوت و دەرگاکەی لە دوای خۆی داخست. دوای یەک دوو پا، سەباح کیسەکەی لە دەست وەرگرتم و دەمی کیسەکەی کردەوە و سەیری کۆترەکەی کرد و ئاوڕی دایەوە و بە ڕەفعەتی وت، ڕەفعەتیش لە چاو ون ببوو:

- نە زەمەن، عالنی گویردو، قۆی گیالسن یومزە.

هەمان ڕێگای گەڕانەوەمان گرتبوو، لە ڕێگا تووشی برادەرێکی هاتین و نەمانزانی بۆچی و چۆن بە بێ ئەوەی پرسیارمان لێکات، کەوتە ڕێگا لە گەڵمان. سەباح بە هەردووکمانی وت:

- قۆی گیادغن یومزە، کیمسە یۆختی.

هەرسێکمان بەرەوماڵی سەباح کەوتبووینە رێ. لە رێ، هیچ شتێکی ئەوتۆمان باس نەکرد کە شایانی باس بێت. لە دەرگاکە نزیک بووینەوە و بە نووکی پێڵاوەکەی پاڵێکی بە دەرگاکەوە نا، ساڵۆنێکی زۆر رازاوەمان بینی، پاشان بە دەستی چەپ ژووڕێک هەبوو، ژوری دانیشتن بوو. دەستی بۆ کیسەکە برد و کۆترە سپییەکەی دەرهێنا و خستییە سەر دەستی و کەمێک دەستی هەڵبەزاندەوە کۆترەکە فڕی و لە سەر سکەی پەردەکە نیشتەوە. بە واقوڕماوییە سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد. هەندەی نەبرد لەوێشەوە هەڵساو و چووە سەر چلچراکە کە بە ناوەند ژوورەکەدا شۆڕببووەوە. ویستم لەوێش هەڵیفڕێنم، بە یەک دوو شەققەی باڵ، بەرە وسووچی ژووررەکە فڕی و کەوتە خوارەوە، یەکسەر پەلاماریم دا و گرتم. باڵیم کردەوە سەیری پەڕە سپییەکانیم دەکرد، سپی وەک چۆڕێ شیر. شاپەڕەکانی لووس و تا دەهاتیش تەنک دەبوونەوە، شەفاف دەبوون و رەنگی هەوایان وەردەگرت. بە سەباحم وت:

- مەن یوە گێدرەم.

کیسەکەم کردەوە و پێش ئەوەی کۆترەکەم فڕێ بدەمەوە ناوی، خستمە ناو چنگم و سەیری چاوە رەشەکانیم کرد. کۆتری ئەتلەس بوو. سپی و چاوڕەش. لە رێگا بووم بەرەو ماڵەوە، دڵەراوکێیەک لەشی تەنیبووم. پرسیارم لە خۆ دەکرد "چۆن جارێکی دی دایکم راگرتنی ئەم کۆترەم لێ قبووڵ دەکات؟". سەرەرای سپێتی و بێگەردی ئەم کۆترە، بۆ دایکم نەک تەنها پیس و پۆخڵ بوو، تەنانەت رەمزی شوومی ونەگبەتیش بوو. بە نیسبەت باوکمیشەوە،تەیروتواڵ لە خوێندنی دەکردم. هەردووک دژی ئەم حەزە بێگەردەی من بوون. بۆ منیش کۆتر جیهانێکی تەواو بوو. جیهانێک بوو پەیوەندی بە شینیی ئاسمان و فرین و گەڕانەوە هەبوو. پەیوەندی بە خولیای رۆژهەڵاتییانەوە هەبوو کە سەیری بۆشاییەکانی ئاسمان بکەن تا چاویان بە شتێک دەکەوێت.

ئاخر چۆن بتوانم ئەم کۆترە بەرمەوە ماڵ؟ چۆن بیبەمە سەربان بە بێ ئەوەی دایکم درکی پێبکات؟ بیرم دەکردەوە و پیلانی منداڵانەی ساویلکەی خۆمم دەهۆنییەوە. زۆرجار پلانی مەحکەمم هۆنیەوەتەوە و لە پرێکدا ریسەکانم بوونەتەوە خوری. لە کاتی بیرکردنەوەدا بووم، دوو کونی دیکەم لە کیسکەکرد. بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت بە دەسبەتاڵیی بچمە ژوورەوە، چونکە، بە خۆم و کیسەیەکی هەڵگەچراو و دوو سێ کون تیاکراو بەسن بۆ ئەوەی دایکم بزانێت "هەمیسان بەزمەکەیە و کۆتر و کۆتربازییەکەی جارانە!" هەروەها گومانیشم نەبوو کە دایکم دەمبینێت.

لەسەر خۆ لە جادەی دیمەشق دەپەڕیمەوە و کەوتمە سەر شۆشتە هەر تەسکەکەی دونیا، هەر کەسێک بەوێدا تێپەڕیایە، دەبوایە بە پێش دوکانی پیرەمێردەکەدا تێپەڕییایە.ئەو شتە سەیرە، دوکان نەبوو، بەڵکو لە کووخێک دەچوو، دەرگا چینکۆ پەڕپوتەکەی لە ژوورەوە دەکرایەوە و پیرەمێردێکی بە ساڵاچوو، بە عاستەم چاوەکانی فلسی سوور و بیست و پێنج فلسی جودا دەکردەوە، بە دانیشتەوە دەستی بۆ قوتووەکانی بەردەمی درێژ دەکرد و لوقم و چوکلێت و مژمژە و گومشکە و گوڵەبەرۆژە و دەیان شیرینی دیکەی دەردەکرد و دەیدایە ئێمە منداڵ. بە تەنیشت چینکۆ داخراوەکەدا تێپەڕیم و گەیشتمە بەرامبەر ئەو بزمارەی قۆڵی چاکەتە سەوزە زەیتوونییەکەمی دڕاندبوو، دووەم رۆژی جەژن بوو. بەرامبەر بەو بزمارە سڵێکم کردەوە. گەیشتمە سەر سووچەکە و ئیتر یەکەم ماڵ، ماڵی حاجی خالیدی قەراجە، ماڵی لەیلا، کچە خرپنەکەی حاجی، رۆژێکیان تەنەکەیەک نەوت دەرژێنێتە سەر خۆی و خۆی دەسووتێنێت. چەند هەنگاوێکیش ماوە بگەمەوە بەر دەرگاکەی خۆمان. سەرێکم هەڵبڕی و سەیری سەربانم کرد، دەمی کیسەکەم بە باشی لوول داو وەک ئەمسەر و ئەوسەری چوکلێتێکیش بە بادانەوە گووشیم و تا هێزم تیا بوو بۆ سەربانەکەی خۆمان هەڵمدا. بەڵام عارەقێکی زۆر لە سەر سەروگوێلاکم کۆبۆتەوە و ونبوونی ئەو سەرلەبەیانییەوە و دڵەکوتێیەکەم هەر وا بە ئاسانی پێ دەشاردرێنەوە!

دەستم بۆ ملیوانەی کراسەکەم برد و ڕێکمخست و بە دەستێکیش عارەقی نێوچەوانم سڕییەوە و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و ناوی خوام لێهێنا و بە ناو لەپ پاڵم بە دەرگاکەوە نا. لە هەمان کاتیشدا، بیرم لەوەش دەکردەوە ئایا دەبێ ئێستا دەمی کیسەکە نەکرێتەوە و کۆترەکە خۆی دەرباز نەکات؟ باشە لەو کیسە تاریکە گەرمە دەبێت چی بکات؟ چۆن ژیانی ئەو کۆترەم کردۆتە دۆزەخ. ئەمەم قەد بە خەیاڵدا نەدەهات.

خۆم کرد بە ژوورا، پەردەکەی بەردەرگام بە روخسارم لادا. پانکەکە ئیشی دەکرد و ساڵۆنەکەمان فێنک بوو، باوکم هێشتا نەهاتبووەوە و نانی نیوەڕۆ نەخورابوو. بۆنی چێشتێکی خۆشیش دەهات و دایکم لە حەوشە بچووکەکەوە بەرەو ساڵۆنەکە دەهات، دەرگای ساڵۆنەکەی کردەوە. ساڵۆنێکی بچووک بوو سێ ژووریشی گرتبووە خۆ. وەک ئەوەی هەستی بە شتێک کردبێت و یەکسەر پێی وتم:

– بۆ هەندە دواکەوتی، لە کوێ بووی کوڕم؟

– لە دەرەوە، لە... لە دەرەوە بووم...

سەیری ترمزە بچووکەکەم کرد کە لە لای دەرگای ساڵۆنەکە دانرابوو. ترمزێکی شەش پاڵوو بوو، لە سنووقێک دەچوو و کرابووە دوو بەشەوە، بەشێکی ئاوی تێدەکرا، بەشەکەی دیش، بەفری لێ دادەنرا. بەفرەکە ئاوەکەی سارد دەکرد و گوونییەکیش دەدرایە سەر بەفرەکەو زۆرجاریش تەماتە و خەیاریان لەسەر بەفرەکە دادەنا. ئەمە داپیرەی سەلاجە بوو. ئیتر ئاوێکی سارد لە بۆڕییەوە بچووکەوە دەهاتە ناو تاسێکی فافۆن کە دوای ئاوخواردنەوە لەسەر سنووقەکە دادەنرایەوە. بە خۆم و هەموو دڵەراوکێکەمەوە چەمامەوە و تاسەکەم هەڵگرت و خستمە پێش بۆڕییەکە و ئاوم تێکرد و بە یەکجار هەموویم خواردەوە، جارێکی دیش پڕم کردەوە و ئەوجارەشیان هەمووم خواردەوە، جاری سێیەم نیوەی تاسەکەم پڕ ئاو کرد و ئەویشم خواردەوە و تاسە بەتاڵەکەم لە شوێن خۆی دانا. هەستم دەکرد فێنکاییەک بە لەشما بڵاودەبێتەوە. دەرگای حەوشەکەی پشتەوەم کردەوە و

بەرەوە ئاودەسخانەکە چووم، مەسینەیەکی نایلۆنی پەمەیی لێبوو، سەرەرای ئەوە بە گسکێکی زبر قەراغی تەشتی ئاودەسخانەکە پاککرابووەوە، یەک دوو سیسارک، هەر دەرگاکرایەوە، بە فرتە، لە پێشچاو ون بوون. دانیشتم و بیرم لە ئاسمان دەکردەوە. بیرم بۆ سەربان و کیسەکە و کۆترە سپییەکە چوو، لە هەمان کاتیشدا سەیری دیواری ئاودەسخانەکەم دەکرد کە تەرەشوع و شێ فۆرم و شیکلی سەیر سەیری دروستکردبوو. لە هەندێ شوێن زەردییەکی بۆر تێکەڵ بۆرییەکی قاوەیی رەنگ ببوو، لە هەندێ شوێنیش گەچەکە خووسابوو، شیکلەکان بە ئاژەڵی ئەفسانەییان دەکرد. لە هەندێ شوێنیش بەرەو تەجریدییەتێک دەرۆیشتن و فیگەرەکان خەسلەتی خۆیان ون دەکرد.

هەڵسام و بێجامەکەم هەڵکێشا و دەرچوومە دەرەوە. بە دەستە راست مەتبەغەکە بوو و پاشان ناردەوانەکان و ئینجا بۆڕی و دەشۆرێکی لێبوو کە بە چەمەنتۆ دروستکرابوو. ئەم دەشۆرە چوارگۆشەییە، لە هەندێ شوێن زبر و لە هەندێ شوێنیش بەماڵنج لووسکرابوو و لە هەندی شوێن ناولەپی ئیشی ماڵنجی کردبوو. دەستم بۆ بۆڕییەک برد و ئاوێکی زۆر دابەزی و پڕیشکی بۆ دەروبەریش دەهاویشت، لە هەندێ شوێن پڕیشکەکە بەر رۆشنایی هەتاوەکە دەکەوت، دەتوت ئەو پریشکە ئاگرانەیە کە لە کەرەسەی لەحیمکردنەوە بەردەبنەوە.

ئەم تیشکەی کە تێکەڵ بە پڕیشکی ئاو دەبێت، فێنکییەکی لێوە پەیدا دەبێت، بەڵام هەمان هەتاویش ئێستا سەربانی کردۆتە دۆزەخ، هەندەی دیکە دۆزەخ بۆ کۆترە بەسزمانەکەی ناو کیسە دەمبەستراوەکە، دەنێتەوە. پڕیشکی ئاوەکەش کوونە تەڕایی لە سەر بێجامەکەم دروست دەکرد و لە سەر نەعلە لاستیکەکانیشم پەڵەکان رەنگێکی دیەکەیان بە نەعلەکەم دەدا. ئەم فێنکاییە بەشێک بوو لەو نەخشەیەی کە خەریک بووم وردە وردە دەمهۆنییەوە. بە گەمەیەکیش دەچوو دەیویست خۆی لە چنگی دەسەڵاتی دایک رزگار کات. گەمەیەک بوو دەیویست ژیانێکی سادە و بێ گرێ دابێن بکات. ئەم ئاوە سەرشێتەی کە وا لەشم بە تەڕایی کون کون دەکات، رەنگە

چارەسەرێک بێت! دەموچاوم شوشتبوو و بەدەموچاوی تەڕەوە بە حەوشە بچووکەکە دەخولامەوە، دەهاتم و دەچووم وەکو بازرگانێک هەواڵی نوقمبوونی کەشتییەکانی بیستبێت. هێشتا عارەقەکانی بڕبڕەی پشتم بە تەواوی نەبووبوونە هەڵم، دایکم دەرگاکەی کردەوە. دایکم بینیمی زۆر سەیر سەیری شتەکان دەکرد و دیققەتی بێدەرەتانیم دەدات. ئەو منی لە خۆی باشتر دەناسی و ویستی خۆی هێور کاتەوە:

- ئەوە چیتە کوڕم، بۆ وا هەرەسانت لێ بڕاوە؟

- نا نا، دایە هیچ نییە بە خوا، دەمویست باخچەکە ئاو دەم.

کێ بڕوای بەوە دەکرد کە بچم دارهەنارەکەمان ئاودەم. دارهەنارە تاقانەکە، بە ئاستەم سێبەری شاشی دروست دەکرد، ڕەنگیشە بە هەموو دووجار ئاوم نەدابێت، بۆچی ئێستا وا بە پەرۆشیی دەمەوێت ئاوی بدەم و خۆمم هەند سەغڵەت کردووە!

سۆندە پیرۆزەییەکەم گرتە دەست، هەتاو گەیاندبویە ئاستی توانەوە، دەمی بە ئاسانی هەڵدەپچڕی و بۆڕی لە خۆی ئەستوورتری قووت دەدا. بە هێز سۆندەکەم چواندە بۆڕییەکەو ئاوەکەم بەردایەوە و سەرەکەی دیکەشم بە پەنجەی کەڵە کۆترۆل دەکرد و سەری سۆندەکەم بەرەو ژێر دارهەنارەکە وەرچەرخاند. گەڵا وردەکانی دەلەرانەوە و زاکیرەیان بۆ گوڵە سوورە وردەکانی دەمەو بەهار گەشابێتەوە. جار جار بە پەنجەی دۆشاومژە ئاوەکەم پەرت دەکردەوە و وەکو فەوارە ئاوەکەم پەرت دەکردەوە. ئەمە گەمە ئاوییە فێنکیی دەدامێ. دایکم جارێکی دیکە هاتە دەرەوە:

- تۆ خەریکی چیت؟ دوێنێ ئێوارە باخچەکەمان ئاودا.

منیش بیرم لە ناوەرۆکی ئاودان دەکردەوە. لە دڵی خۆم دەموت ئاخر ئەم ئاودانە و ئەو ئاودانانەی ئێواران وەکو یەکن. من خۆم تینوومە. لە دڵمەوە ئەم وشانە دەردەچوون. خۆ دایکم نازانێت هەنار ئاودانی زۆر دەوێت، ئەی نازانێت بەم ئاودانە هەنارەکان جوان گەورە دەبن و سووردەبنەوە، لە داخی ئەوەی یەکێکیش لێیانکاتەوە بۆ خۆیان شەق دەبەن. هەناری شەقبردوو

هەموو خەونە داپلۆسراوەکانی رۆژهەڵات لەخۆی دەگریت. کاتێکیش شەق دەبات، دەنکی بێگەرد وکریستالین، رۆشن وەکو بەردی نایابی خۆشەکراوە، وێنەی شەرابی خۆتی تیا دەبینی، دەردەکەون.

ئەم وردە بیرۆکانە، ئەم وشە نەزۆکانە، ئەم هاتوچۆیانە بە شانۆگەرییەکیان دەکرد کە خۆم دەرهێنەری بم. چاوەڕێی ئەوە بووم دایکم جارێکی تر بچێتە ژوورەوە و ئاووهەوای حەوشە هێمنتر بێتەوە، ئەم شەپۆلە گوماناوییانە بڕەوێنەوە، ئاسۆ رووناکتر بێت، ئەوجا یەکسەر بەرەو پەیژەکان و بۆ سەربان تێیدەقێنم.

دایکم بە سینیەکی مسینەوە چووەوە سالۆنەکە. "ئێستا خۆم پاڵەوانی مەیدانم!" سەیرێکی سەرووی پەیژەکانم کرد و هەڵمکوتییە سەربان، دەرگا تەنەگەکەم کردەوە و ئاگرێکی بەجۆش هەموو سەربانی کردبووە دۆزەخێکی راستەقینە. بیرم دەکردەوە "کێ نالێت ئێستا دەمی کیسەکەی نەکرابێتەوە." سەرەتا هیچم نەبینی، پاشان سەرم بۆ ژێر قەرەوێلەکان شۆڕکردەوە، کیسە بۆرەکەم بینی کەمێک دەجوولێتەوە. بە سکە خشێ، بە سەر خۆڵە تەپانییەکەی سەربان کە وەک ئاردەخۆڵی لێهاتبوو، وەکو مارمێلکە دەخشام. لە کیسەکە نزیکبوومەوە و دەستێکم بۆی برد و رامکێشا.

کیسەکەم گرتە دەستەوە و هەڵسامە سەر پێ، بە ئاسپایی پزیشکیکی نەشتەرگەریی دەمی کیسەکەم کردەوە. دەنووکە پەمەییەکانی کرابوونەوە، هالاو و گەرمیی سەربان تووشی هەناسەبڕکێی کردبوو. چیبکەم خودایە! دەبێت هەر ئێستا جامێک ئاوی بۆ بێنم. کردمەوە ناو کیسەکە و بەپەیژەکاندا چوومە خوارەوە. گەیشتمە دوا خانەی پەیژەکان، لەبەردەم دەستشۆرەکە چەمەنتۆیەکە دایکمم بینی، بە هێمنییەکی رادەبەدەرەوە بۆڕییەکەی کردۆتەوە نازانم خەریکی چی بوو، یەکسەر:

- کوڕم ئەو تۆزوخۆڵە چییە لە سەر کراس و بێجامەکەت؟

منیش بە خۆ تەکاندنەوە، هیچم بۆ نەدەهات و دەمم تەتەڵەی دەکرد:

- بەربوومەوە.

- باشە بەم گەرمایە چیت دەکرد لەو سەربانە؟
دەستێکی بۆ پەیژەکانیش درێژکردبوو.
ئاخر خودایە ئێستا چ بڵێم.
- هیچ، بەربوومەوە.
لە راستیدا وەڵامم نەبوو. کاتی پلاندانانەکەم بیرم لەم کەلێنە نەکردبووەوە کە وا ئێستا لەبەردەمم وەکو نارنجۆک دەتەقێتەوە. هەستیشم دەکرد خەریکە نەخشەکەم هەڵدەوەشێتەوە. دایکم بۆڕییەکەی گرتەوەو گەڕایەوە سالۆنەکە، منیش وەک سەربازێکی فیرار، دوای کەوتم بیریشیم لە لای کۆترەکە بوو. جارێکی دیش بۆ تاسەکەی سەر ترمزەکە نووشتامەوە و پڕم لە ئاو کرد و خواردمەوە. گومان جارێکی دی، بە رووتی، لە ناو ماڵەکەدا دەسووڕایەوە. بیرم لە پینەیەک دەکردەوە کە بتوانێت بە شێوەیەکی کاتیش بێت، ئەم بۆسە و کەمینانەم بۆ نوێترالیزە کات. بیرم لەوە دەکردەوە لە پڕێکدا بچمە سەربان و کیسەکە بهێنمە خوارەوە و بچم کۆترەکە لە ژێرزەمینەکە دانێم. گەڕامەوە حەوشەکە و بە قوونەچاو لە هەلێک دەگەڕام، لە کاتێکی گونجاو دەگەڕام بۆ ئەوەی هەڵکوتمە سەربان. چوومە چێشتخانەکە و دایکم خەریکی بسمیلکردنی حاجەتەکان بوو:
- دایە چیت لێناوە؟
دایکیشم فەخفوورییەکی دانا و بەرە و حەوشەکە رۆیشت، پڵاوپاڵێوێکی فافۆنی بە دەستەوە بوو، پڕی لە لاسکە کەرەویز و تەڕەتوورە و دوو سەلکە پیازی سپی و سێ سەرە توور؛ پێی دەچوو بگەڕێتەوە سالۆنەکە، بە دەم رێیەوە وتی:
- یاپراغ.
بەڵام ئەوەی من ئارەزوویم لێدەکرد، وا دەرنەچوو، نەچووە سالۆنەکە و بەڵکو بەرامبەر بە پەیژەکان، لە تەنیشت حەوزە ئاوەکە، مەبەستم دەستشۆرەکە چەمەنتۆییەکەیە، دانیشت و خەریکی شووشتن و پاککردنی تەڕە و سەوزەکەی ناو پڵاوپاڵێوەکە بوو. منیش لە دڵی خۆمدا بە توڕییەوەبە

خۆمم وت "هیچ، نە بیخۆ!" کات لە بەرژەوەندی مندا نەبوو و بێوچان بیرم لەوە دەکردەوە کەی دەبێت دایکم بۆ یەکێک لە ژوورەکان بگەڕێتەوە و منیش دوای کارەکەی خۆم کەوم. بەڵام دایکم هەند لەسەر خۆ کارەکانی ئەنجام دەدا، کات بە تەواوی لە نێو دەست و پەنجەکانی بووڕابوونەوە. تاڵ تاڵ لاسکە کەرویزی هەڵدەگرت و سەیری دەکرد و پاشان بۆ ژێر بۆڕییەکە درێژی دەکرد و دەیشوشت. ئەم کارەی لە ناو ئاوهەوایەکی بێدەنگ و هێمندا ئەنجام دەدا. لە دڵی خۆم دەموت "ئاخر سەوزە شوشتن هەندە کاتی دەوێ؟" بیرم لەوەش دەکردەوە کە ئێستا دەمی کیسەکە کراوەتەوە و کۆترەکەکە سەر قەراغی ستارەکەیە و بە تەمای فڕینە. کۆتریش پێش ئەوەی بفڕێت، دیققەتی ئاراستەکان دەدات. ئەوەم دەزانی ئەگەر بێتو کۆترەکە کەمێ هێز بداتە خۆی و تەقەللایەک بکات، دەمی کیسەکەی بۆ دەکرێتەوە. لە هەمان کاتیشدا سەیری چەقۆ دەسک سپییەکەی دەستی دایکمم دەکرد و سەیری ئەوەشم دەکرد کە چۆن دایکم لاسکەکان لە گەڵاکان جودا دکاتەوە. چۆن شیعری نەنووسراو لەو تەڕانەوە بەر دەبوونەوە.

چوومە ژوورەوە. پانکەکە بایەکی فێنکی ساڵۆنەکەی پەخش دەکردەوە. چوومە یەکێک لە ژوورەکان، بێ مەبەست سەیری جامخانەکانم دەکرد: قۆری و ریزە فنجان و کەوچکێکی زەرکەفت. بیرم لە ماڵی هاوسێیەکەی قەڵا کردەوە. لەو لاشەوە کانتۆرەکە و ریزە دۆشەک و لێفەی رەنگاورەنگی لەسەرە. سەیری بەڕە هەڵواسراوەکەم کرد کە شاری مەککە و کەعبە و لە دەوروبەریش گڵۆپ و چلچرا داگیرساوە. دەستم پێیدا هێنا، قەدیفەیەکی لووس و ناسک بوو، رەنگەکانم بە ناوپەل بزواند. خۆم پێ رانەگیرا، گەرامەوە حەوشەکە، دایکم خەریک بوو هەڵدەستا و پڵاپاڵێوەکەی رادەوەشاند و بەرە و مەتبەغەکە دەچوو. هەر کە ئەو چووە ژوورەوە و منیش یەکسەر بۆ سەربان.

یەکسەر سەرم بۆ ژێر قەرەوێلەکە شۆڕ کردەوە. چی ببینم خودایە. دۆزەخ بووە قەترە ژەهر و دڵۆپ دڵۆپ دەکەوێتە سەرم. ئەوەی دەیبینم

راستە! دەمی کیسەکە هەڵپچرابوو و کۆترەکەش، لە تەنیشت کیسەکە، دەنووکی کردبووەوە. وریا، چاوە رەشەکانی دوتوت سەرچاوەی تیشکن، چۆن بتوانم سێ لای ئەم قەرەوێڵەیە کۆنترۆل کەم. بیرم لە چارەسەرێکی کتوپڕ دەکردەوە. حەزیشم دەکرد دەست و پەنجەکانم دوای کۆترەکە بکەون و ببنە قەفەز بۆی. سەیریم دەکرد و حەزم دەکرد لیم تێبگات. لەوە تێبگات ئیتر منم ساحێبی ئەو و رەفعەت تەواو. بە ئاسپایی جارێکی دیکە کەوتمەوە سەر سک، وەکو کیسەڵێکی ماندوو بۆی دەخشام. ئەویش وردە وردە سێبەری ژێر قەرەوێڵەکەی جێدەهێشت و بەرە لای هەتاوەکە دەڕۆیشت، واتە بەرەو ئاسمان. تەنها بە دوو شەققەی باڵی رێک و پێک کۆتایی بەم کورتە چیرۆکەی من دەهێنێت. ئەو دەفڕێت و منیش لەسەربان، وەکو غەریبێک دەچمە خوارەوە. پێش ئەوەی بچمە خوارەوە، سەیری کۆترەکە دەکەم تا لە چاوان ون دەبێت.

هەناسەم بە تەواوی لە خۆ بڕی، بێسوود بوو، بە لای راستدا وەرچەرخام هەر بێسوود بوو. وەک شەرکەرێکی بەزیو، بە سکە خشکە گەڕامەوە، هەتاو ملە باریکەکەمی لە پشتەوە دەسووتاند. لە خوارەوەش گوێم لە دەنگ دەنگە دەبوو. جارێکی تریش کەوتمەوە سەر سک و بەرەو کۆترەکەم کەوتمە خشکە. ئەمجارەیان بە تەواوی کەوتبووە بەر خۆرەتاوەکە و ئاسمانی لێوە دیار بوو، واتە قەفەزەکەی من! سەرە بچووکەی کەمێک لار کردەوە و شینایی ئاسمانی فراوانی بینی. چۆن نەداتە شەققە باڵ، دەمێک نییە لە کیسە دۆزەخییەکە رزگاریی بووە! موچڕکێکی سارد لەشمی تەنی.

هەڵفڕییە سەر ستارەکە، کۆتری غەریب عادەتی نییە یەکسەر بفڕێت، دەیەوێت بزانێت بەرەو کوێ دەبێت فڕێت. منیش تەنها دوو مەترێک لێوەی دوور بووم، دەتوت سەدەها کلیۆمەتر لێوەی دوورم. حەزم دەکرد ئاسمان ببێتە پەشتەماڵێک. بەڵام کاتێکیش سەیری ئاسمانم دەکرد، ئەفسووس! بە پێچەوانەی داخوازییەکانی من، شین و قووڵ و فراوان بوو. هەندە بەس بوو بداتە شەققەی باڵ! هەموو شتێک لەبار بوو بۆ ئەوەی لە لای من نەمینێتەوە.

چەند شەققەی باڵێکی سپی و گەرمایی کیسەیەکی کاغەزین پێک ناکەن! بۆچی لە ساڵۆنەکەی ماڵی سەباح، پێش ئەوەی بیخەمەوە کیسەکە، یەک دوو تاڵ شاپەڕەکانیم هەڵنەقاچی! ئەم وردە گلەیی و تانانە بە چی دەچن ئێستا. دەمزانی هەندەش نابات، دەچێتە سەربانی کۆشکەکەی ماڵ حاجی عەبدوڵلا، کۆشکەکەیان بەرامبەر بە ماڵی ئێمە بوو. ئەگەر لێرە نەیگرمەوە چۆن لەسەر کۆشکی ماڵی هاوسێییەک بۆم دەگێڕێتەوە، نەخوزەڵا  کۆشکی ماڵی ئەوانش. چونکە ئەمە یەکەم جارم نەبوو.

ئەرێ کۆتر و بەرزایی کۆشکەکان، ئەمە گەورەترین کۆست کەوتنی منی نەدەگەیاند! هەندەش نابات، هەر لە سەر کۆشکەکەوە و ئاسمانی گەڕەکی ئیمام عەبباس دەناسیتەوە و ئینجا بە گوڕ هەڵدەفڕێ و یەک دووجار بەسەر ئاسمانی ماڵی رەفعەت ئەفاندی دەخوولێتەوە ئینجا دەنیشێتەوە و هێدی هێدی بەروە کولانەکە دەچێت، ئەگەریش دەرگای کولانەکە داخرا بێت، ئەوە لە بەر سێبەرکە پاڵ دەداتەوە. تەنها دوای حەسانەوە ئینجا کۆتری ماندوو ئاو دەخۆنەوە.

منیش بۆی دەچووم و خۆم کردبووە کۆترێکی سپی هاوچەشن. کڵاوە قیتەکەی سەرم وەکو ویرگوڵ بەرەو پشتەوە ئاماژەیەکی بێمانای دەدا. هەستم دەکرد پەڕە پەرتوبڵاوەکانی پێم لە خۆڵتەپانیی سەربان دەخشێت وئاردە خۆڵەکە دەماڵێت. باڵەکانم توند لە قەبرغە گیر دەکرد و نووکی شاپەڕەکانیش، لە پشتەوە لە کلکەکەم نزیک دەبوونەوە. هەستم بە چەرمەکانی سەر دەنووکم دەکرد. دەتوت قیبلەنومان، بۆنی ئاسمانیان دەکرد. کلکەکەم چڕ و یەکگرتوو، هەندەی نەمابوو لە عەردەکە بخشێت. منیش سپی و کەڵگەت بۆی چووم. وەکو دوو هاورەگەز و هاوشێوە، دەوروبەرم هەموو سپی دەچووەوە. ئارەزووەیەکی شێتانەش لە قەبرغەکانمەوە ئاگریان تێبەربوو، نەمدەتوانی ئارەزووی فڕینم هێور کەمەوە. بەڵام ئەو دایە شەققەی باڵی سپی و لێم دوورکەتەوە.

ئەوە چی بوو ئاسمانی شاری داگیرکرد؟ قەتییە باڵقاچراوەکەی قەڵا بوو، یا ئارەزووە لە بن نەهاتووەکانی من؟ وام لە خڕی خاسە، قوڕگ پڕ هەنسک، بازووەکانم شل و خاو. ئەوە چین هەمیشە دەفڕن و لێمان دوور دەکەونەوە؟ ئەو پەلەوەرانەی کە لە توخمی خەونن. ئەم باڵندانەی کە پڕاوپڕی ئێسقانەکانین گڕ و بایە، هەر ئەوانن قەوارەی راستەقینە دەدەنە ئارەزووەکانمان، ئازادی دەبێتە بەشێک لە شیکلیان. کلکەکانیان شارەزاتر، شاباڵەکانیان بە هێزتر و گەندەمووەکانی ژێر سکیشیان لە ئاسمان فێنکیی کۆدەکەنەوە و گەرمیی دەدەنە ئەو هێلکانەی کە لەسەری کڕ دەکەون. رەنگ و بینایمان پاراو دەکەن و ئاسمانەکانی ناوەوەمان پەروەردە دەکەن. لە دوورەوە، لە ئاسمانە هەرە دوورەکانەوە گەمەمان لە گەڵ دەکەن، گەمەی نێوان فراوانی ئاسمان و حەزەکانمان. گەمە منداڵییەکانمان هەراشتر دەکەن تا دەگەنە ئەندازەی خەونەکەنمان.

ئەمجارەیان شەققەیەکی سپی بوو موچڕکێکی ساردی خستە هەناومەوە، وەک خەنجەرێکی ژەنگن هەوای شەق دەکرد. یەک دووجار خولایەوە و بەرزتر دەبووەوە، واتە بچووکتر. منیش چوومە سەر قەروەێلەکان، ژێرەوەم بزێو بوو بە هۆی سپرینگەکانەوە، سەرەوەشم بزێو بۆ فڕینی حەزەکان. تا دەهات دوور دەکەوتەوە، تاکو بوو بە خاڵێکی هەند بچووک و لە هەمان کاتیشدا خاڵێکی بچووکیش بەرەو ئاسمانی ماڵی ئێمە دەهات. ئەوەی رۆیی کۆترە سپییەکە بوو و ئەوەشی دەهات ئەو کووکوختییە نەعلەتییە بوو کە لە سەر دارقەڵەمتۆزەکەی حەوشەی ماڵی سمایلە سوورە هێلانەی کردبوو و دەگەڕایەوە. قەڵەمتۆزی گەڵا شاشی هەمیشە سەوز، کووکوختی گرتە باوەش و بۆنێکی کەسکوونیشی بە گەڕەکدا پەخشکردەوە.

وەک داماوێکی بچووک، ملم شۆڕکردەوە و بە پایەکانی پەیژەکەدەا دەچوومە خوارەوە و لە هەمان کاتیشدا خەریکی خۆ تەکاندن بووم، هەستم بە بێ تاوانی دەکرد، بەرامبەر بە خەتایەک وەخت بوو بیکەم. لە کۆتاییشدا هیچم نییە بەرگری لێکەم، ئەم هەموو پلان داڕشتن و سیناریۆیانە دەبنە چنگێ

گەمژەیی و بەرامبەر بە دایک و باوکم بەرجەستە دەبن. ئەوەی دەمینێتەوە: عارەقێکی زۆر و تەپوتۆزێکی بێ ئەندازە و تینووتییەکی بێسنوور و غەمێکی کەڵەکەبووش... هەموو شتەکان بێ مانا دەهاتنە پێش چاوم.

دەرگای سالۆنەکەم کردەوە، هەموو لە دەور سینییە یاپراغەکە دانیشتبوون و باوکم لە شوێنەکەی خۆی و دایکم لە شوێنەکەی خۆی و برا گەورەکەشم پارووپەکی لە دەم بوو قسەشی دەکرد؛ سەری هەڵبڕی و بە دەست ئاماژەی بۆ کردم و وتی: *"ئەوە لە کوێ بووی؟"* فێنکی ژوورەکە و هەنسکێکیش گرێکوێرەی لە گەرووم دابوو. چ بڵێم و باسی چی بکەم! ئەو تراژیدیایەی رووی دا لە ئاستێکی زۆر نزمە، چونکە تەنها لە نێوان من و کۆترێکدا رووی بوو. بەڵکو حەیفە ناوی تراژیدیاشی لێ بنرێت. باسکردنی گەمژەییەکەی بۆ خۆی. هیچم نەوت و چوومە ریزی ئەوانەوە: ئەوان بە کەیفەوە پارووپان لە یاپراغ دەدا و منیش نیوەی هەست و هۆشم لە ئاسمان بوو، نیوەکەی تریش وردە وردە دەهاتەوە ئاستە نزمەکانی واقیع و بۆنی شبیتم دەکرد. بۆنە تایبەتەکەی یاپراغی کوردان.

ئەم چیرۆکە کورتەی منداڵیم بەسەر دەکردەوە و بە دەم رێوەش گەڕەکی ئیمام عەبباسم بڕیبوو وگەیشتبوومە ناو بازاری زێرەڕەنگرەکان. من و ئەم چیرۆکە دەیان ساڵ کەوتبووە نێوانمان، بەڵام بۆنی یاپراغێکی بەهارانە لووتی دەتۆزاندمەوە. بەسەر کاشییە گێڕ وگەواڵەکاندا دەڕۆیشتم و تا گەیشتمە سەر شەقامی جمهووری. گەڕەکی شەریکەم تەواو لە دووی خۆ جێهێشتبوو و ماڵیش تەنها دەرگایەکی داخراو بوو و هیچی تر!

سبەی دەبێت بچمە گەڕەکی بەگەکەکان، واتە گەڕەکی بەگلەر. گەڕەکی بەگلەر و مزگەوتی پاسوانزادە، کورتکراوەی بەسەرهاتەکانی ساڵانی ١٩٥٩ ە. لەوێ لەبەر سێبەر کۆبووەکان، پرسیار لە لقە دارخورمایەکە دەکەم کە ساڵانێک ببوونە مۆڵگەی خەونەکانی من. رەنگبێت، ئەو، ئەو و بەس سوراغێکی لە لا بێت، سۆراغی شتە لەبیرچووەکان! ئەرێ سێبەریش نهێنییەکانی هەتاو شیتەڵ ناکات!

# پاسوانزاده

تا ساڵانی حەفتاش ناوی "پاسوانزادە" بە نیسبەت دانیشتوانی گەڕەکی بەگلەر شتێکی نامۆ بوو. ئەوان بە مزگەوتی پاسوانزادەیان دەتوت "مەلاقاون"؛ گوایە کاتی خۆی دەوروبەری ئەم مزگەوتە زەرعات و بێستان بووەوە و هەموو ئێوارەیەکی هاوینانیش، مەلای مزگەوت بە کاڵەگێکی ژێر هەنگڵییەوە گەڕاوەتەوە ماڵ. بەڵام دوای ئەوەی باوکم دەبێتە مەلای ئەو مزگەوتە و لە سەرەتاکانی ساڵانی حەفتاش، دەست دەکات بە چاکسازیی لە مزگەوتەکە. دەرگای حەوشە دەگۆڕن و هەروەها ئاودەستەکان پاک دەکرێتەوە بەرمیلە ئاوێکی دیکە دەکرن و جوان بە بۆیاغی رەش، بۆیاغی دەکەن.

لەو کاتەی کە دەرگا دارینە کۆنەکە هەڵدەتەکەێنن و خەریکی رنینی دیوارەکە دەبن، لە پڕێکدا، پارچە مەڕمەڕیک دەردەکەوێت کە لە سەر نووسرابوو "مزگەوتی پاسوانزادە" و ساڵی دروستکردنیشی لەسەر نووسرابوو. بۆیە قالبە مەرمەڕەکە دەردەهێنن و جارێکی تر دەیخەنەوە سەر دەرگاکە و ئیتر لەو کاتەوە، بە رەسمی ناوەکەی دەبێتەوە "مزگەوتی پاسوانزادە".

نازانم چەند ساڵ تێپەڕیوە، بەڵام دوای ئەم هەموو ساڵە، وا ئێستا گەڕاومەتەوە بەرامبەر ئەم دەرگایە. وەختە ببمە کانییەکی بیروەری و بە جەستەمدا داچۆڕێم. هەموو خانەیەک لە لەشم هەڵگری یادەوەرییەکە، هەموو شانەیەکی داوی چیرۆکێکی تیایا، هەموو مولوولولەیەک حەکایەتێکی مەحاڵی تیا حەشاردراوە. هەست بە بوونی چەندین نهێنی دیکەش دەکەم، رەنگە هێشتا کاتی گێڕانەوەی نەهاتبێت. رۆژێک دادێت ئەوانیش چەقەرە بکەن.

کانی بیرەوەری تەنها کانییەکی بیروەریی ئاویی و تەڕ نییە، بەڵکو خاوەن تیشک و رەنگدانەوەکانی خۆشییەتی ، سەرداریی هیشکایی و مەودا

بزوێنەکانی خۆی دەکات، تەپوتۆز و دوورییە سیحراوییەکانی خۆی دەپارێزێت، بە تایبەت کاتێک بە قەد باڵای مرۆڤدا هەڵدەشاخێت. گشت ئەم توخمانە دەبنە رەگەزە پێکهێنەرە بنەڕەتییەکانی. بزووتنەوەی یادوەری، بزووتنەوەیەکی شاقوولییە، بەشدارە لە دروستکردنی ساخوتمانی ناوەکی مرۆڤ. هەمیشە لە گەڵ ئێستاکاندایە و لە گەڵمانیش گەورە دەبێت، لە سرکترین کاتەکاندا فریامان دەکەوێت و بەهێزتریشییانە. هەندێجاریش بە بێ ئاگاداری و ویستی ئێمەش گۆڕانکاریی بەسەردا دیت. بۆیە یادەوەری شتێکی وەستاو نییە. وەکو چەکی یەدەک هەڵیدەگرین.

وەکو هەموو گەڕەکە کۆنەکان، خانووەکان لە دەور مزگەوتەوە بڵاودەبنەوە. ئەو دەبێتە چەق و شت و ئینسانەکان بە دەوری ئەودا دەخولێنەوە. ئەم دەوروبەرە پێی دەڵێن گەڕەکی بەگلەر. یەکێک بوو لە گەڕەکە دژوارەکانی شاری کەرکووک، دژوار بوو بۆ خۆ راهێنان، دژوار بوو لەو ساڵانەی کە هەموو عێراق بۆنی شەڕوشۆڕ و ئینقلابات و شۆڕشی لێ دەهات.

قەڵاش بە نیسبەت ئێمەوە دوور بوو و زیاد لە پێویستیش بەرز بوو، بۆیە لەم نێوانە حەسیرەکانی مزگەوتی پاسوانزادە هەڵیبژاردم، بۆ ئەوەی دواتر، دوای چەندین ساڵیتر زۆر حەکیمانە تا هێزی تێدایە فڕێم دات. تورم هەڵداتە کێشوەرێکی دیکە. خۆ راهێنان لەو ئاووهەوا تایبەتە یا دەتکاتە گێلەپیاوێک کە تەنها لە خەیاڵێکی کەم مەودا دا، لە سێبەری خودا پەرستیدا، هێمنییەک رۆحە پێنەگەیشتووکەت هێور دەکاتەوە، یا ئەوەتا بە رامبەر بە راڕایی کات، بەرامبەر بە ناعەدالەتی شوێن، خەنجەرە دەم کول و دارینەکەت دەردەهێنێت و دەڵێیت ماڵئاوا.

بەگلەر واتە بەگەکان. وشەیەکی تورکمانی ئاماژە بۆ سەردەمێک دەکات کە ئێمە بە هیچ شێوەیەک ئاسەوارەکانیمان نەبینی، ئەگەر بە دیققەتەوە سەیرت بکردبایە، رەنگە زاکیرەی شتەکان هەندێ بیرەوەرییان زیندوو

بکردبایەتەوە: سەڵتەی پاکوخاوێن، زریزەی سەعاتی بەرباخەڵ، کەشیدەی زەردی بۆنخۆش، بۆنی عەتری خۆماڵی، قووتووی... بۆنی میسکی دەسکرد، پێڵاوی چەرمی بریقەدار، کراسی سپی زۆر خاوێنی ئوتووکراوی بێ یەخە، هەندێ دەسمایەش بۆ رۆژی سیا، ئەگینا هیچی تری لێوەدەکرا. زۆربەی زۆری ئەو "بەگانە" خانەنشین بوون، مەبەستم ئەوانە کە هاتوچۆی مزگەوتیان دەکرد، خەونی رابردوویەکی دووریش هەندێجار سواری ئەستۆیان دەبوو، بە تایبەت کاتێک لە دەوری سۆپە نەوتییەکەی حەجرەکەی باوکم کۆ دەبوونەوە. قسە نەستەقەکانیان بە جۆرێ هەڵدەبژارد کە نەک تەنها هەر ئێستایان بۆ دابین بکات، بەڵکو داهاتووی کوڕ و کورەزاکانیشیان بخاتە چوارچێوەیوکی کۆمەڵایەتی لایقەوە. پراگماتیک بوون، رەنگە ئەمە چووبێتە جیناتیانەوە، یا ئەوەی مەزهەبی حەنەفی رێگاخۆشکەری بووبێت. بە تێر و تەسەلییەوە سەیری ئیمرۆیان دەکرد، خۆیان بێبەش نەدەکرد لە لەززەتە دونییەوییەکان و بیریشیان لەوە دەکردەوە، کە ئەم گردبوونەوانەیان لە دەوری مەلا و مزگەوت، خودای باری، پارچە ئەرزێکیان پێ رەوا دەبنێنێت بۆ ئەوەی وەک خانەنشینی ئەبەدی لە باخچە و مێرگەکانی بەهەشت بە کەیفوماشا رابوێرن.

هۆی گواستەوەی ماڵمان لە قەڵاوە بۆ ئەم گەرەکە ئەوە بوو کە بۆ باوکم زۆر دوور دەکەوتەوە. دوو هاتوچۆ لەمسەری شارەوە بۆ ئەوسەری شار، کات و خەرجی دەوێت. بۆیە هەندەی نەبرد خۆمان لەم گەڕەکە دۆزییەوە. سەرەتا "بەگەکان" بە لالچێکەوە سەیری مەلایەکی کوردیان دەکرد کە تازە لە گوندەکانی ساڵەییەوە و هاتووە و هەندەش نییە لە زیندانی موسەیەب ئازاد کراوە، ئێستاش، هەموو هەینییەک، لە جیاتی پێغەمبەر سەر مینەبەرەکە دەکەوێت و وەعز و ئامۆژگارییان دەکات و بۆ هەموو کاروبارێکی ئاینیش دەبێتە راوێژکاریان. لە روخساری باوکمدا بەسەرهاتەکانی چەند ساڵەوە لەوەبەریان دەهاتەوە یاد. زۆرجار بێهۆ دەبووە قین. مەبەست لە بەسەرهاتەکانی پاش نیوەڕۆی چواردەی تەمووزی ١٩٥٩ە.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ئاسایی نەبوو، چونکە کوردەکان و کۆمۆنیستەکان پێکەوە دەیانویست یادساڵی "شۆڕشی گەلاوێژ" بگێڕن و بەو بۆنەیەوە خۆپیشاندانێک ساز بدەن. بەڵام ئەم خۆ پیشاندانەوە بە هێمنی و سەلامەتی کۆتایی نایەت. چونکە کاتێک خۆپیشاندانەکە دەگاتە کۆتایی شەقانی ئەتلەس، دەبێتە تەقە، پێش تەقەکەش، تورکمانەکان بە سواری ئوتۆمبیلی سەربازییەوە، بە تەنیشت خۆپیشاندانەکەدا تێدەپەڕن و گەنجە توندڕەوەکانیشیان ئیستیفیزای خەڵکە کۆبووەوەکە دەکەن. ئەم گەنجانە لە کۆتایی شەقامەکە و هەندێکیشیان لە چاخانەکان کە شوێنی کۆبوونەوەکانیان دەبێت، ئا لەو ئاستە دەیکەنە تەقە. پاشان دەبێتە شەڕە بەرد و دار، بە پێی سەرچاوەکان ژمارەی کوژراوەکانی تورکمان دەگاتە سی کوژراو و سەد و سی برینداریش. بەڵام ئایا دەبێت هۆکاری ئەم پێکدادانە چی بووبێت؟

ئەم شەڕ و کوشتارە بە جۆرێکی دی گەشەی دەکرد ئەگەر بهاتبایە ڕۆژی ئایندە ڕێ بە گوندنشینە کوردەکان بدرابایە کە بۆ تۆڵە سەندنەوە، بە تێڵاوە روویان کردبووە شار. ئەوە ئەو کات بە تەوای ئەم شەڕە گەشەی دەکرد و زام و برینەکانیشی هەندەی دیکە قووڵتر دەبوو. بەڵام پرسیار ئەوەیە کێ بوو بووە هۆکار و سەبەبی جۆشدانی ئەم فیتنەیە؟ بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تورکمانانەی کە تازە لە حەپسخانەکان بەربووبوون، مەبەست لەوانەیە کە لەگەڵ عەربە توندڕەوەکانی دەستیان هەبووە و هەر ئەوانیش هانیان دابوو بۆ ئەوەی دووبەرەکیی بخەنە نیو کورد و تورکمانەکانی شاری کەرکووکەوە. بەڕێوەبەری ئەمن بە ئاشکرا لای تورکمانەکانی ئەوەی درکاندبوو کە لە حالەتی وادا پشتگیرییان دەکرێت، بێگومان هۆکاری دیکەش هەبوو.

کاتێک باوکم لەو مزگەوتە دادەمەزرێت، تەنها هەر پێنج ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕیی بوو، بۆیە کۆمەڵگە بچووکەکەی دەوروبەری پاسوانزادە لە سێ بەرە پێکهاتبوو. تورکمانە داخ لە دڵەکان بەرەیەکیان پێکهێنابوو، بە ئاشکرا دەیانویست مەلایەکی تورکمان لە جێی باوکم دابنێن. بەرەی

دوومیش، ئەوانیش هەر تورکمان بوون، بەڵام دەیانویست چاوەڕێ بکەن و بزانن تا چ رادەیەک دانوولەیان لەگەڵ مەلای نوێ دەکولێت. بەرەی سێیەمیش، جگە لە یەک دوو حاجی کە بە ئەسڵ خەڵکی حەویجە بوون یەکێکیان ناوی حاجی کوردی بوو، ئەوانەی دیکە کوردە هەژارەکانی گەڕەکی عەرەسە بوون و پشتگیرییان لە باوکم دەکرد. دڵسۆز و دەسکورت بوون. زۆربەیان تورکمانیشیان نەدەزانی و تورکمانەکانیش حیسێبێکی ئەوتۆیان بۆ نەدەکردن، چونکە ئەوان نەوەی بەگەکان نەبوون، بەڵکو کۆڵهەڵگر و کرێکاری بینا و عارەبانە بە دەست بوون، تەنها یەک دووێکیان نەبێت خانەنشین بوون. خانەنشینی بێ مووچە! ئەوان، باوکمیان بە بێ غەل وغەش خۆشدەویست، بەڵام لە کۆڕ وکۆبوونەوە نا رەسمییەکاندا هیچ دەنگیان نەبوو. وەک فریشتەی بێدەسەڵات بە دەور باوکمدا فڕە فڕیان بوو. لە راستیدا فریشتەی بێباڵ بوون.

بە تێپەڕبوونی کات، رووبەری ئەم ململانێیە تەسک دەبووەوە، پەیوەندییە شەخسییەکان بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ دەبوون و باوکمیش چاکسازییەکی زۆی لە مزگەوتەکە کرد و بە چاوێکی یەکسانیشەوە سەیری دەوروبەرەکەی خۆی دەکرد. کاریسمایەکی هەبوو، کە لە ناخی خۆیدا، باوەڕی وا بوو کە باوکی بەشێکی گەورەی لە شەخسیەتی ئەو پێکهێناوە. ئەو بڕوای وابوو کە هەودایەکی نهێنی هەیە کە نەوەکان پێکەوە گرێ دەدات، لە پشتێکەوە دەترنجێتە پشتێکەوە. ئەو لە رێگای خەونەکانییەوە زۆرجار نهێنییەکانی کەشف دەکرد و دونیای پێ لێکدەدایەوە، بە تایبەت کاتێک خەونی بە باوکی ببینیایە. لە دوو تۆی ئەو شەوانەی کە خەونی بە باوکییەوە دەبینی، نهێنییەکی لە لا دەدرکاند و زۆرجاریش راست دەدردەچوون. ئەو لە حەوت ساڵییەوە، کاتێک لە خەو هەڵدەستا، هەتاو لە پشتییەوە هێشتا وەنەوزی دەدا. ئەمە بە هیچ جۆرێک زۆرانبازی نەبوو لە گەڵ سروشتدا.

دوای پێنج شەش ساڵ، باوکم پشت بە خۆبەستوو، بە هێز و باوەڕەوە، پێی راستی دەنایە حەوشەی مزگەوتەوە. منیش ئەوکات، تازە پەڕوباڵم

دەردەکرد. بە بێ ئەوەی هەستی پێبکەم، ئەمە بۆ من زۆر بوو. لە ژوورەکەیدا، کتێبخانەیەک و فەرشێک، بۆ زستانانیش سۆبەیەک. سادە و دەوڵەمەند. زۆرجار دەچوومە ژوورەکە و سەیری کتێبەکانیم دەکرد. کاتی بانگدانیش بهاتبایە، ئەوانەی لە ژوورەکە بوون دەچوون بۆ دەزنوێژشوشتن. جا من بە تەنها دەمامەوە. سەیری کتێبەکانم دەکرد، کتێبی وا هەبوو تەمەنی سەد ساڵ دەبوو، بەشێکی هی باپیرەم بوو. لەسەر مێزەکەش چەند کتێبێکی بەردەستە هەبوون، ئەوانەی زوو زوو موتالەعە دەکران. لە نێو ئەو کتێبانەی سەر میزەکە، کتێبیکی بەرگ سووریی ئەستوور هەبوو زۆر سەرنجی رادەکێشام. رەنگە هۆی ئەم سەرنجڕاکێشانە ئەوە بووبێت کە رەنگی بەرگەکەی بووبێت، چونکە کتێبی مەلایان زۆربەی زۆریان رەنگی خۆڵیان هەیە، هەر بە رەنگی ئاخیرەت دەکات. کاتێکیش کتێبێکت هەڵدەگرت و دەتکردەوە بۆنی دونیای لێ نەدهات و یەکسەر"ئێمە لە خۆڵین و دەگەڕێینەوە خۆڵ!"ت دەهاتەوە یاد.

ئەو رۆژەی بە تەنها لە ژوورەکەی مامەوە. ئاگری سۆپەکە شین شین نێڵە نێڵی دەکرد. دەستم بۆ کتێبە ئەستوورەکە برد، دەمێک بوو مەراقم لێیدابوو. بە زەحمەت پێمهەڵدەگیرا. هەڵمدایەوە. پڕی لە نەخشەی وڵاتان و تابلۆی رەنگاورەنگ و وێنەی کەسایەتییە بە ناوبانگەکانی دونیا بوو. لە سەر بەرگەکەشی بە خەتی کووفی، بازنەیەک دروستکرابوو، کالیگراف و هونەری تەجریدی بە جورێکی وا تێکەڵ ببوون، ئاماژەی بۆ دەستێکی رەنگین دەکرد. پێیشی دەچوو هێزێکی نهێنی بزوێنەری بووبێت. نەخشەی هەمان بەرگ، لە لاپەرەی یەکەم دووبارە ببووەوە، بەڵام بە خەتی سپی لە سەر پانتاییەکی مۆری کاڵ. بێجگە لە کتێبی قوتابخانە، وا بزانم ئەوە یەکەم کتێب بوو کە دەستم دابێتێ، یا رەنگە کتێبێکی دیکە بووبێت بە ناونیشانی "لووتێکی عەجایب" کە برا گەورەکەم لە کتێبخانەی قوتابخانە ئیستیعارەی کردبوو؛ بە شەوقەوە سەیرم دەکرد. وا بزانم هەمان چیرۆکی پینۆچۆی ئیتالییەکە بوو، ئەوەی کە والت دیزنێ دەیکاتە یەکێک لە شاکارەکانی فلیمی کارتۆن.

چیرۆکی دارتاشێکە کە بووکەشووشەیەک بە دار دروست دەکات و پاشان ڕۆحی دەکەوێتە بەر و گەورە دەبێت و دەیخەنە مەکتەب، ئیتر هەر کاتێک درۆیەکی بکردبایە لووتی درێژ دەبوو. ئەمە دەرزێکی ئەخلاقی بوو بۆ منداڵان و باس لە زیانەکانی درۆ دەکات.

من لە حوجرەکە مابوومەوە. بانگ تەواو بوو و باوکم بە دەم خوێندنی وێردەوە، لە دەزنوێژ شووشتن دەگەڕایەوە حوجرەکەی، بە دەستیش هێمایەکی بۆکردم، مەبەستی ئەوە بوو دانیشم تا ئەو لە نوێژ دەبێتەوە. حەرەم پڕ ببوو لە نوێژکەران و چاوەڕوانی باوکمیان دەکرد بۆ ئەوەی بچێت پێشنوێژییان بۆ بکات. منیش بە تەنها لە ژوورەکەی مامەوە. دەستم کرد بە هەڵدانەوە لاپەڕەی کتێبە ئەستوورەکە.

وەکو کۆرپەیەک خستبوومە باوەش و خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی بووم. کەوتمە سەر لاپەڕەیەک کە وێنەی ئاژەڵ و باڵندەی تێدا بوو. لەبەر ئەوەی هێشتا بە تەواوی نەمدەتوانی عەرەبی بخوێنمەوە، دڵی خۆم بە تەماشاکردنی رەسمەکان دەدایەوە. سەرەوەی وێنەکە ئاسمانێکی سپی بوو، هەندێ پەڵە هەوری قاوەیی ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کەسپییەکە شینە. دە دوانزە باڵندە، بە مەنزوورێکی کلاسیکی ئەوەیان نیشان دەدام کە باڵندەکان دەفڕن و دەیانەوێت کاغەز-ئاسمان جێبهێڵن. بە وەرزی کۆچکردن دەچوو. لەملاو ئەولاش، دوو جۆرە درەخت، لقوپۆپیان بڵاوکردبووەوە و هەمان رەنگیشیان هەبوو، واتە قاوەییەکی کاڵ. نە دەزانرا چ جۆرە درەختێکن. پاشان لە دووڕا، زنجیرە چیایەک، قووڵیی دەدایە مەنزوورەکە؛ لە قەد پاڵەکانیش، گژوگیا، دارودەوەنێکی چڕی لێبوو کە بە ئاسانیش لە دوو دارچنار جودا دەکرانەوە. خانوویەک و بەرهەیوانێک ئەتمۆسفێرێکی فێنکیان دروست کردبوو. لە تەنیشت خانووەکەش، خانۆچکەیەکی لێبوو. ئیتر بەرەو ئەودیو، حەوشێکی فراوان کە پڕی لە ئاژەڵ و باڵندەی هەمەچەشنە بوو. جگە لە ئەسپێک و گوێدرێژێک، جوانوویەکیشی لێبوو کە لە تەنیشت جوانەگایەک دەلەوەڕی و مانگا و گۆلکێکیش، کەمێ لەولاتریش گامێشێک و

سەگێک و تانجییەک هەبوو. لە پشتەوەش، هێسترێک و عەلەشیشێک و مریشکێک و کەڵەبابێک و مریشکێکی دیکە. دوو سێ جووجەڵەش دوای کەوتبوو و یەکێک لە جووجەڵەکان سواری پشتی دایکی ببوو. بە نارێکیی خەریکی چینە بوون. ئەم باڵندە و ئاژەڵانە بە گرافیک ئەو لاپەڕەیەیان رازاندبووەوە. لەو لاتر، کۆترێکی هیندی، ئەوانەی کە کلکیان گڤ دەکەنەوە ملیان بەرەو پشتیان دەچەمێننەوە، لەگەڵ کەروێشکێک و کۆترێکی حاقو، پێ رووت و چاو روون، گۆشتی سەر دەنووکیش ، وەکو کلسی نێو موغارەکان لەسەر یەک کۆبووبووەوە؛ پێکڕا چینەیان دەکرد. کولانەیەکیش بۆ سەگ دروستکرابوو. لە پاڵ هەر ئاژەڵ و باڵندەیەکیش ژمارەیەک دانرابوو، لە خوارەوەش هەمان ژمارە دووپات ببووەوە، ناوی گیانلەبەرەکانی لەسەر بوو.

لە لاپەڕەکەی دیکە، هەمان دیمەنی لێبوو، بەڵام ئاژەڵ و باڵندەی دیکەی لێبوو. زۆربەیانم دەناسییەوە. لە ناو هەموویان قازێکی جوان و مل درێژی سپی هەبوو، زۆر سەرنجی رادەکێشام. دەنووکی بۆ ژێر ئاوە تەنکەکە درێژکردبوو کە بە تەما بوو رووەکی ئاوی و قەوزە بخوات. سەری لە ژێر ئاوەکە دەرهێنا و لەملاوئەلای دەنووکیشییەوە ئاوەکەی فلتەر دەکرد و چ خۆراکێکیش دەمایەوە و قووتی دەدا. وەک خڕۆکە، هەندێجاریش خڕەی دەهات. لە تەنیشتی سۆنەیەکی لێبوو، یەک دوو سۆنەی بچووکیش بەدوایەوە بوون، ئەوان بەرەو قازەکە دەڕۆیشتن. هەر کاتێکیش قازەکە ملی درێژ بکردبایە، هەموو لاپەرەکەی داگیر دەکرد. هەستت دەکرد کە لاپەرەکە دەبووە شەوێکی تاریک و ئاوێکی شینی سازگار و ملێکی درێژ و سپی وەک چەقۆیەک لاپەڕەکەی دەکردە دوو لەتەوە.

منیش کراسێکی خەتخەتم لەبەرە و خەریک بووم لە ئاوەکە نزیک دەبوومەوە، کاتێکیش دەستم بۆ قازەکە درێژ کرد، خۆی فشکردەوە و پەڕەکانی قەبارەیەکی گەورەتریان دەدایێ و بەرە رووم هات. سەیری چاوە رەشەکانیم کرد کە لە گەڵ دەنووکەکەیدا لێکترنجابوون، چاوە رەشە

جوانەکانی لە شەوە قەترانییەکە رەشتر بوون. بە ئاستەمیش سەری با دەدا و دەیویست لێم نزیک بێتەوە و بە تەما بوو هێڕشم بۆ بەرێت. کاتێک قازەکە بەو شیوەیە تورە دەبوو و بەرگریی لە خۆی دەکرد، سۆنەکانی دەوربەری دەرەوینەوە و دوور دەکەوتنەوە و لە دووی خۆیان وردە شەپۆلیان دروست دەکرد و ئاوە نووستووەکەیان بە ئاگا دەهێنایەوە. من بە تەواوی لە قازەکە نزیک بووبوومەوە و بە فرسەتی زانی و هێڕشی بۆ هێنام، منیش هاوارم کرد و یەکسەر لاپەڕەیەکەم هەڵدایەوە و پەردە لە رووی ئەو دیمە دادرایەوە.

لە لاپەرەکەی دی، وشەکان بە ئارامی خەوتبوون. هەوڵێکم دا، بۆ ئەوەی بیانهێنمەوە ئاگا، ناو لەپم بەسەریانا هێنا، لووس و بێگرێ بوون، هەمووی پێکڕا لە ژێر لێفەیەک خەوتبوون. لە سەر یەک دۆشەک. ئایا وشە خەون دەبینێت؟ بە راستی بیرم لەم رستەیە نەکردبووەوە. دەستە بچووکەکەم وەکو چەرچەفێک خستە سەریان.

هەستم کرد کە لاپەڕەی ئاژەڵ و باڵندەکان لە خەو هەڵسابوون و بە ئاسانی هەست دەکرا کە لە حەوشەکە خەریکی لەوەر و چینە بوون. بەڵام لەم لاپەڕەیە، شتەکان جیاوز بوون. ئەم وشانە سەمبۆلن، هیچیان پێ نەدەوتم. سەیری رەنگی وشەکانم دەکرد، هەر وشەیەک بە ڕەنگ سوور کرابوو، پاشان چەند وشەیەک بە رەنگی رەش لە دوای ئەوەوە نووسرا بوو. سەیریانم دەکرد و وشەکانم دەناسییەوە. ئەمە (ک) و پاشان (ر) و پاشان (ع) بوو، ژمارەی (١) یان لە پێش بوو. دوای ئەم ژمارەیەش داشێک هەبوو و پیتەکە دووبارە ببوونەوە، بەلام پیتی (م) زیاد کرابوو. ئەوەی وشەکانی لە یەکتر جودا دەکردەوە رەنگ بوو. بۆ من ئەم شتانە مانایان نەبوون.

لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی ئەو کتێبە ئەستوورە بخوێنمەوە، بە خێرایی لاپەڕەکانیم بەسەر دەکردەوە و لاپەڕەکانیم هەڵدەدانەوە، چاوم بە نەخشەی وڵاتان کەوت. چاوم بە نەخشەی کێشوەر و وڵاتان کەوت کە لە کۆتایی کتێبەکەدا بوون. نەخشەی عێراقم بینی و توانیم کەرکووک لە سەر نەخشەکە

بناسمەوە. سێ خەتی لێوە دەردەچوو. دوو خەتی رەش، یەکێکیان لەوەی دیکەیان ئەستوور تر بوو، سێیەمیشیان شین بوو. خەتە شینەکە کاتێک بەرەو باکوور بچووایە، بەڵام دوو خەتە رەشەکەی دی، یەکێکیان بەرەو باشوور و ئەوەی دیکەشیان بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشت. بەڵام خەتە شینەکە تا بەرەو باشوور بچوایە ئەستوورتر دەبوو تێکەڵی خەتی شینتر و ئەستوورتر دەبوو. سەیری ئەملاوئەولای کەرکووکم کرد و لە پیتی (ز) دەگەڕام. باوکم منی بینی کە بەوجۆرە نووشتاومەتەوە سەر کتێبێک لە کتێبەکان، زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و خەریکی وێردی پاشنوێژ بوو. منیش یەکسەر لێم پرسی:

- ئەوە بۆچی پیتی (ز) لە دەوروبەری شاری کەرکووک نەنووسراوە؟

- لە چی دەگەڕێی ئەحمەد؟

- لە گوندی زەردک.

باوکم پێکەنی و وتی هەی گەوجە گوندی هەند بچووک لە نەخشەیەکی هەند بچووک چۆن جێی دەبێتەوە!

منیش وەکو بڵێی ئازاریان دابێتم و وتم:

- ئەرێ زەردک بچووک بوو؟

ئەم دیالۆگەی نێوان کوڕ و باوک، گەڕاندمییەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر زوو. دەنگەکان بە باریکی رژانەوە نێو بێدەنگییەوە.

سەیری دەرگای مزگەوتەکەم کرد داخرا بوو. نیوەڕوان دادەخرا. بە فیرۆم زانی لە دەرگا بدەم. سەیری دەڕابە داخراوەکەی سەرتاشخانەکەی حاجی قادرم کرد، رەنگە ئێستا خەریکی سەرخەو شکاندن بێت. دوکانێک بوو بە دەستی چەپی مزگەوتەکە، بەڵام کاتێک لە دەڕابەکە ورد بوومەوە، توێژێ غوباری لەسەر نیشتبوو و لە سووچەکانیش جاڵجاڵۆکە تەونەکانی خۆی رایەڵدابوو، ئەوەم لە لا ئاشکرا بوو کە ئەم دوکانە دەمێکە نەکراوەتەوە.

حەکایاتەکانی ئەم سەرتاشخانەیە بەشێ لە تەمەنی ئەو سەردەمەم پێکدەهێنێت. هەموو سەرمانگانێک دەچوومە سەر کورسییەکەی حاجی قادر و سەری دەتاشیم و پاشانیش بە گوێزان پشت ملی چاکدەکردم. تا نۆرەشم دەهات، خۆم بە سەیرکردنی ئەو تابلۆیانە دەخافڵاند؛ یەکێکیان زۆر سەرنجی رادەکێشام. ئەویش تابلۆی تاج مەحەل بوو، هەموو سەرە مانگێ هەمان حەوز و هەمان فوارە و هەمان رێبوارانی باخچەکە چێژیان دەدامێ. ئەو کات چیرۆکی ئەم بینایەم نەدەزانی، نەمدەزانی کە ئەم باڵەخانەیە بە یەکێک لە رەمزەکانی عیشق و وەفا لە سەرتاپای جیهان دەناسرێتەوە. شاە جیهان، ئیمراتۆری مەزن، بە دیاری پیشکەشی ئەرجەمەندی هاوسەری دەکات. ئەوەشم نەدەزانی، کە بە تەمای دروستکردنی کۆشکێکی دیکەش بووە، ئەو کۆشکەیان دەبوایە لە مەڕمەڕی ڕەش دروست کرێت، بەڵام مەرگ بواری نەدا کە ئەو پرۆژەیە ئەنجام دات.

هەروەها لە تەنیشت ئەم تابلۆیە، تابلۆی مزگەوتە بە ناوبانگەکەی سوڵتان سەلیمی قانوونیش هەڵوسرابوو. چوار منارە کەمەر ناسکەکە، بە ئاسماندا بەرزبوونەتەوە و گومەزێکیشیان لە باوەش ناوە.

حاجی قادر تورکمان بوو، سەرەتا لە بەرەی دژ بوو، پاشان وردە وردە لە باوکم نزیک بووەوە، بۆ ئەمەش هۆکاری زۆر هەبوو، جگە لەوە کە دوکانەکە وەقفی مزگەوتەکە بوو، خۆشی سەرەتا نیمچە مجێورییەکی دەکرد و نیمچە مەعاشێکی هەبوو و کرێیەکی زۆر کەمیشی دەدا. شتێکی رەمزی بوو. رەنگە لە ساڵانی سی و چلەکاندا دانرابێت. پێشی دەچوو ئەم کارە جۆرە تەوافوقێکی نێوان جەماعەت بووبێت. لە رێگای پەنجەرە بچووکەکەوە، کە بە هێڵەگێکی شاش داپۆشرابوو، لە دوکانەکەیەوە حەوشەی مزگەوت دەبنیرا، سەرەرای ئەوەی رووناکی لێوە دەهاتە ژوور، حاجی قادر چاوێکیشی لە حەوشەکە بوو. کاتێک بە حەوشەکەشدا تێپەڕبوایە، ئاغزە جگەرەیەک بوایە، گەڵایەکی هێشکەوە بوو، یا پەڕی کووکوختییەک بوایە، لە سەر رێی بوایە لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرت و بەمە نیمچە مەعاشەکەی خۆی

حەڵاڵ دەکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی کە باوکم پێویستی بە مجێوڕێکی تەواو هەبوو، بۆیە هەندەی نەبرد، حاجی مەحەمەدی درێژ پەیدا بوو. درێژ و سپیکەڵانە و نەزۆک. ئێمەی زۆر خۆشدەویست.

لەم چاکسازییە، حاجی قادر ئیتر هەر خەریکی بەڕێوەبردنی سەرتاشخانەکەی بوو و مەلا حەسەنە کوێریش وەکو خۆی مایەوە. سەرەرای ئەوەی کە نابینا بوو، کەتبووەوە بەرەی دژ. تورکمانە ئەشرافەکان، بە مەلای خۆایانیان دادەنا، چونکە تورکمانێکی تۆخ بوو. مانەوەی تەنها لە بۆ هاوسەنگی بووە، چونکە جگە لەوەی کە دەنگی لە قورعان خوێندن زۆر ناخۆش بوو، ئەو چەند ئایەت و سوورەتانەشی دەزانی کە لە تەعزییە و موناسەبات دەیوتەوە پری لە هەڵە و پەڵە بوون. مەلا نییە لەم هەڵانەش خۆش بێت.

لە رووی کاروباری ئاینیشەوە زۆر کۆڵەوار بوو. لەو سەردەمە مەندێلێک و دوو ئایەت ئینسانی دەکردە مەلا، وەکو چۆن موزەمیدەکان دەبوونە دکتۆر و ئەوانەی خەتەنەیان دەکرد دەبوونە سەید، ئەویش نازناوی مەلای پێ رەوا بینرا. بە تورکمانیش دەیانوت "مولّا حەسەن". زۆرجار باوکم لە ناو جەماعەت ئایەتی بۆ چاک دەکردەوە. ئەمە ئاماژەیەک بوو بۆ بۆ ئەوەی کە پێشی بڵێ "دژایەتی تۆ رەگێکی پتەوی نییە". لە ناو تورکمانەکان زۆر حورمەتی دەگیرا، ماوەیەکی کەم بوو ژنەکەی وەفاتی کردبوو، هەندەی نەبرد کچە تورکمانێکی رێک و پێک چووە ژێر دەستی مەلای کوێر و نەخوێندەوارەوە.

مزگەوت گۆڕەپانێکی فراوان بوو بۆ ئەوم ململانێیە کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتییانە. ئەمە بە نیسبەت منەوە گۆڕەپانی گەورەکان بوو.

منیش لەو سەردەمە زۆر هاتوچۆی مزگەوتەکەم دەکرد و کردمە گۆڕەپانی خۆم. گوێم بۆ حەکایەت و بەسەرهات و قسە نەستەقەکانی گەورەکان رادەگرت. من لە ناو ئەو گەورانە منداڵیم بردە سەر. بە تایبەت ئەو رۆژ و شەوانەی کە باوکم مێوانێکی زۆری لە گوندەکانی دەورووبەری

کەرکووک و هەولێرەوە دەهات، زۆربەیان هاوڕێی منداڵی بوون و هەندێکیشیان لە لای باوکی ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتبوو. مەلاکان بە بێ جانتا و پریاسکە، سووک سووک و پێ نەرم دەهاتن و لە حەوشە فراوانەکە دەحەسانەوە. هەمان روخسار و هەمان حەرەکات و هەمان دەموچاو دووبارە دەبوونەوە. نوقسانی یەکێکیان دەبووە جێی باس و هەندیجاریش نوکتەی سەرنجڕاکێش مەلایانی لەبەر پێکەنین دەچەماندەوە. ئەوان زۆرجار وایان دەزانی منداڵێکی وەکو من هەموو وردەکارییەکانی ناناسێتەوە، بۆیە بواریان بە خۆیان دەدا و زۆرجاریش هەموو شتێکیان دوت. منیش هەموویم لەلای خۆم تۆمار دەکرد.

بە تایبەت وەرزی هاوینان دەهاتن، لە سەر دۆشەکە رەنگینەکان و دەنووستن و لەسەر بالیفە سوڵتانییەکان پاڵیان دەدایەوە و لە سەرەوەش گڵۆپی دارتەلەکەی پشت مزگەوتیش رەنگی لێفەکانی دەبریقاندەوە. دۆشەکی ئەستوور و نەرم، پێش نووستن فێنک دادەهات. کێ حەزی نەدەکرد لەو حەوشە فراوانانە و لە ژێر ئەو دوو دارخورمایە کە سێبەری شەوانەی دروست دەکرد، نەخەوێت. لقی دارخورماکان شۆڕ دەبوونەوە و لە نێوانیان چۆلەکە و کوکووختی هێلانەیان دەکرد، هەندێجاریش باڵندە سپییەکانی شەوان فڕە فڕیان دەکرد. لە دەوری گڵۆپی دارتەلەکەی کە تەنها هەر مەترێک لە سەرووی دیواری حەوشەکەوە بوو، مێشوولە و پێشوولە و پەپولەی بۆری تیسکنی شەوان، لە سنوورەکانی ژیان و سووتاندا ژیانیان دەبردە سەر. لە بەر رووناکی گڵۆپەکان وەکو پڕیشکە رووناکی پەڕیو دەکەوتنە بەر دم و دانی شەمشەمەکوێرەکان و لەبەر رووناکی دەڕەوینەوە. میکرۆژیانێکی تراژیدی، لەو بەرزاییانە، بەرامبەر بە منارە و گومەت وجوودی هەبوو. رووناکی دەبووە ژیان و مەرگ لە هەمان کاتدا. ئاسمانە قوولەکانیش لەو دوورایيانە بە ئەستێرە کاڵەکانیەوە دەجریوانەوە. لە سەر خانووەکانی ئەمبەر و ئەوبەریش، کوللە دەوری قەرەوێڵەکانی داوە و

شەربەکانی خەونیش فێنکایی و جوانییان تیا حەشار دراوە. ئەم ئاهەنگەکانە، شەوان لە دەوروبەری مزگەوت دادەگیرسان.

لە نێو ئەو شەوە دووبارەبووانە، شەوێکی تایبەت هەیە، با باسی ئەو شەوەتان بۆ بکەم. دوای شیوی ئێوارە و چاخواردنەوە و ئەوەی جگەرەی دەکێشا، جگەرەی خۆی لە پاکەت و قوتوو دەرهێناو ئیتر قسەوباس درێژەی دەخایاند. پاڵدانەوەی مەلا، سەد دەر سەد لاسایی کردنەوە پاڵدانەوەکانی بەهەشتە، بە کەیفوماشا پاڵدەدەنەوە. ئیتر لەو شەوانەدا، فەنتازیا و خەیاڵ و کەراماتی مەشایخ و حەڵقەی سۆفییەکان و لە کووچە تاریک وتنووکەکانی خەیاڵیش دەیان حەکایەت لە دایکدەبوو. ئا ئەو شەوە خەوی لێ زڕاندم. ئەوان هەندێکیان چووبوونە ژێر لێفەکانیان و یەکێکیان خەریکی تارەتکردن بوو و ئەویتریش پرخەی دەگەیشتە سەربانەکان و یەک دوانیشیان لە ئاودەست بە کۆکەکۆک دەگەڕایەوە. بێگومان هەندێکیش لە ناو شیرینی خەوندا خەونی دەبینی.

منیش لە ژێر لێفەکەمەوە سەیریانم دەکرد. شەو راشکابوو، دونیا هێمن. شەو لە شەوێتی خۆی دەژیا. مەلا جەرجیسی سەربیر بە دەم خەونەوە لە بارەی شەو هەندێ قەسیدەی هۆنییەوە، بۆنی هەتاوی لێدەهات. ئەم هۆنراوانە وەکو مۆسیقا بوون، نەدەگیران؛ وەک ئاو شیکلیان دەگۆڕا. برگەیەک کۆتایی دەهات و برگەیەکی دی دەستی پێدەکرد، پەخشان بوو، هەڵمی شیعری لێهەڵدەستا. لە شیعر بووەوە. لێفەکەی لەسەر خۆی لادا، هەر بە دەم خەونەوە قاپقابە ئەستوورەکانی کردە پێی و لە سەر کاشییەکان تەقەی دەهات، بێدەنگیی شەوی شەق دەکرد؛ بەرەو گوێی حەوزەکان هەنگاوی دەنا، دەرپێیە سپییەکەی لە پشتەوە فشببووە و هەردوو فەقێیانەکەشی ئەرزیان دەماڵی. منیش نەفەسم لە خۆم بڕی بوو و سەیری ئەو نمایشە ئاسمانییەم دەکرد. فەقێیانەکەی هەڵماڵی و دەستی بە دەزنوێژ هەڵگرتن کرد. هەردوو ناو لەپی پڕ ئاو دەکرد و دەموچاوی پێ دەشۆرد، هەر دە پەنجەی رۆ دەکرد ژێر رێشەکەیدا و پێستەکەی تەڕ دەکرد. دوو

پەنجەشی بە پشت ملیا هێنا و لە هەردوو ئەنیشکیشییەوە ئاو دادەچۆڕی. بە ئاستەم گوێم لە دوعاکانی دەبوو، نەمدەزانی بە چ زمانێک دوعا دەکات. هەندیکی کوردی بوو و باقییەکی تریشی هەر بە فارسی و ئەفغانی دەچوو.

هەڵسایە سەرپێی و کلاوەکەی چێ کرد و قاپقاپەکانی کردەوە پێ و بەرەو ریزە حەسیرەکە رۆیشت کە هاوینان دوو ریزیان لەبۆ نوێژی بەیانیان هەڵنەدەگرت. پێش نوێژدابەستن سەیریکی دیوارە بەرزەکانی دەکرد و هەر دوو بازووی وەکو پێغەمبەران بۆ بەتاڵیی ئاسمان کردەوە. لە ژێر لێویشەوە وێردی دەوت، دەپاڕایەوە، فرمێسک وەک خوڕەی جۆگەلە، شین شین دەکەوتنە ناو باوەشی شەوەوە. سکاڵا کردن و ئایەتی ئاویی تێکەڵ دەبوون. گوێم لە شەققەی باڵی دوو قازی زۆر سپی بوو، چاوە خەواڵووەکانی منی ئاوەڕشێن دەکرد. دوو قازەکەی لە تەنیشتی نیشتنەوە، بە دوو فریشتە دەچوون، یەکێکیان لە لای راستی و ئەوەی دیکەش لە لای چەپی. هەر دوو قازەکە باڵەکانیان کردەوە و مەلا جەرجیسیان داپۆشی. ئەویش دەستیکردبووە نێو پەڕەکانی سینگی و نەوزاشی لەگەڵ ئەو گەندەمووە گەرمانە دەکرد. پاشان دەستی بۆ ملی یەکێک لە قازەکان برد و وردە وردە بەرەو سینگی و زیاتر شۆڕبووەوە. قازەکە دەنووکی بۆ ژێر باڵی درێژکرد و دەیویست ملە درێژەکەی نغرۆ کاتە نێو قوڵە فراوانەکەی مەلا جەرجیس.

لە نێو تاریکیی و تیشکە زەردەکان کە لە پشتی دیوارەکانەوە ئاودیوی حەوشەکە دەبوون، تێکەڵی پەڵە سپێتی دەبوون، لە پڕێکدا مەلا جەرجیس لە نێو هەردوو قازەکە نەدەبینرا. چاوەکانم هەڵگڵۆفی بۆ ئەوەی بتوانم زیاتر شتەکان لە یەکتر جودا بکەمەوە. وردە وردە سپێدە وەکو گوێزان شەوی شەق دەکرد دونیا سەر لە نوی هەڵدەهات. ئەستێرەکان لە شوێن خۆیان دەکوژانەوە، دەزووی رەش لە دەزووی سپی جودا دەکرایەوە. هاژەی ئەبەدی شار لە دایکدەبوو. سیحرەکانی تاریکیی دەتوانەوە. کۆکەی یەکێکیان و بەڵغەمی ئەویتریان، واقیعی هێناوە ئاستە نزمەکانی خۆی. هەندەی نەما

بوو بۆ نوێژی بەیانی، مەلایان کاژێری بایۆلۆژیان لە هەموو شتێک بەهێزترە، یەک لە دوای ئەویتر لە خەو هەڵدەستان و بەرەو حەوزەکە دەچوون. دونیا وردە وردە ڕووناک دەبووەوە و وێنەی قازەکە و وێردەکانی شەویش لە مێشکی مندا جریوەیان دەهات.

دوای نوێژی بەیانیان، مەلایان سەرخەوێک دەشکێنن، پاشان چای و قاوەڵتی، خەیاڵیش بۆ من ڕێگاکانی خۆی خۆشدەکرد.

دوای سەرخەوشکاندنی مەلایان دەبوایە بۆ قاوەڵتیکردن بهاتنایە ماڵی ئێمە. منیش دەبوایە بە سینی چاییان بۆ بەرم. لەبەر ئەوەی شەوی ڕابردوو، یەک دەنک خەو نەوچووبووە چاوم، بە خەواڵوویی دەهاتم و دەچووم. وەکو تارمایی لە پێشچاویان دەردەکەوتم. جار ناجارێک سەیری مەلایەکم دەکرد و ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دەدامەوە. لە خۆم دەپرسی ئایا دەبێت، ئەویش هەستی بەوە کردبێت کە ئیمشەو یەک دەنک خەو نەچووەتە چاوم و بە دیار سیحرەکانی ئیمشەوەوە خەوم لێنەکەوتووە! سەیرێکی دیکەی کردم و بە چاو پێی وتم: "خۆ ئەمە یەکەمجارم نییە کە قاز دێنە باوش و دیدارم". حەزم دەکرد بە کوردییەکی ڕەوان بەسەرهاتی ئەو مەلایە بۆ مەلاکان بگێڕمەوە و ئەویش هەر بە چاو پێی دەوتم: "جا کێ بڕوات پێ دەکات ڕۆڵە!". لەم ئاڵوگۆڕە بێدەنگەدا بووین، باوکم پێی وتم: "بڕۆ کوڕم دایکت بانگت دەکات.".

منیش سینییە چایە بەتاڵەکانم هەڵگرت و بۆ لای دایکم گەڕامەوە کە لە تەنیشت سەماوەرەکە بە هێمنی و بێدەنگی، بە کەوچک شەکری دەکردە ناو ئیستیکانەکانەوە، بە جۆرێک سەیری دەکردم وەکو ئەوەی ئەویش ئاگاداری گشت بەسەرهاتەکان بێت و پێی وتم:

- بزانە کەس هێلکەو ڕۆنی ناوێت.

منیش کە گەڕامەوە ناو جەماعەت، مەلایەکیان بە دەنگێکی بەرز پێدەکەنی و دەسەسڕە سپییەکەی دەرکردبوو و ڕایخستبووە ناولەپی و بە هێواشی هەڵیگرت و دەستی کرد بە سڕینەوە ناوچەوانی؛ مەلاکەی تەنیشتی دەمی بردە

ژێر گوێی و شتێکی وت، ئەو زیاتر بە پشتا چەمایەوە. باوکمیش بە هێمنی نانی دەخوار و ئاگاداری سفرەکەش بوو بۆ ئەوەی بزانێت هەموو شتێک تەواوە و کەس شتێکی دیاریکراوی ناوێت و سەیرێکی کردم و پێی وتم:

- دوو چای، یەکێکیان بێ شەکر بێت.

ئەو بەیانیایانە زۆر زوو گەرم دادەهات و بۆنی چای شیرین و بۆنی رۆنی راعی و قرچە قرچی هێلکە و رۆن بە حەوشەکەدا بڵاودەبووەوە. هەستم دەکرد پێنج دەقەجارێک، پلەیەک گەرمایی بەرز دەبێتەوە، بەم پێیە تا ناوەندی نیوەرۆ، ئیتر دەرەوە کش و مات. کش و مات هیچ بەرجەستەیەک ناجوولێتەوە، هەتاو لە ناوەندی ئاسمان پشوو دەدات و قەدەرێک رادەوستێک، سێبەر نامینێت، شتەکان وەکو کات دەمەیێن، ئەمە مەینی سەرما نییە بەڵکو مەینیی گەرمایە. وەکو ئێستا؛ ئاسمان وەکو کاغەزێکی سپی هیچ لێنەنووسراو دەخوێنمەوە.

بەو نوێژنیوەڕۆیە کەس لە دەرەوە نەوبوو؛ دونیا لە ناو گەرمی و ئەو هاڵاوەی کە لە زەمین بەرزدەبووەوە بارستایی دەدایە زەوی، بارستایی دەدایە هەموو بەرجەستەیەک. لەشی قورس دەکرد و ئاراستەکانم لێ تیکدەچوو. "ئاخر دەبێت ئێستا ماڵی ئێمە لە کوێ بێت؟" ئاوڕم دایەوە، بەرامبەر مزگەوتەکە کۆڵانێکی تەسک هەبوو، لەو کۆڵانەوە ژنێکی عەبا لەسەر، لە دوو شوێنیش لێوو و چەناگەی کوترابوو؛ بە بن دیوارەکەدا تێدەپەڕی و دەیویست خۆی لە نێو سێبەرە تەنکەکاندا ون کات. وەکو تارماییەک لە نیو ئەو تەپوتۆزەی کە نەعلە لاستیکەکەی دروستی دەکرد، دەردەچوو. کەوتە بەر تیشکی هەتاوەکەو بە ئاستەم دیار بوو. وەکو سەراب دەلەرایەوە.

ئەو بە لای دەستی راست و منیش بە دەستی چەپ، بە ژێر دیواری مزگەوتەکەدا رۆیشتم و گەیشتمە جێی ئەو دارخورمایەی کە جاران قەسپێکی زۆر خراپی دەگرت کە بە "کوردکوژ" بەناوبانگ بوو. دوو

دارخورما بوون، یەکێکیان بڕییەوە و ئەویتر، سەر شکۆفەکەی بەرەو ئاسمانی مزگەوتەکە بەرزکردبووەوە. لە داخا شەقی بردبوو.

بە پێش ماڵی حاجی سادقە درێژدا تیپەڕیم و کەتمەوە سەر شەقامی دیمەشق کە بە دەستی راست فرۆکەخانەی سەربازی بوو و هەر بە دەستی چەپیشدا چەند ریگایەک هەبوو کە دەچوون بەرە و عەرەفە و ئەڵماس و تەپە و گەڕەکەکانی سەرووی شار. چەندین ساڵ ئەمە ریگای من بوو بۆ ئەوەی بچمە قوتابخانەی باوەگوڕگوڕ. بە پێش یانەی ئاسوورییەکاندا تێپەڕیم، پێش ئەوەشی ببێتە یانە، خانێکی گەورە بوو گەنم و جۆ و دانەوێڵەیان تیا دەفرۆشت. بەرامبەر بە یانەکەش جادەیەک بەرەو عەرەفە دەچێت کە مێژوونووسان دەڵێن ئەمە ناوە کۆنەکەی کەرکووکە "ئارافە" و هەندێجاریش بە "ئاراپخا" دەخوێندرێتەوە. سکەیەکی شەمەنەفەر گەڕەکی عەرفە لە گەڕەکەکانی ئەمدیو جیا دەکاتەوە. سکەی شەمەنەفەری نێوان بەغدا و هەولێر.

ئەم سکەی شەمەنەفەرە یادەوەریی زۆرم لێی هەیە. بە منالی زۆر سەرنجی رادەکێشام، بە تایبەت ئەو تەرەزینەیەک کە بەسەر سکەکەی زەردک دا تێدەپەڕێ و بە خێراییەکی لەبەرچاو بە تەنیشت گوندەکەماندا رەت دەبوو. ئەو کات بە سەحەنی تایرمان دەزانی. بە دەستی باشووری ئەم سکەیە ئیتر ئوردوگا ئەبەدییەکانی رژێمە. فیرقەی دوو کە یەکێک بوو لە فیرقە هەرە بە ناوبانگەکانی لەشکری عێراق، بەرامبەر بە بیرە نەوتەکان، سەنگەرەکانیان هەڵکولیبوو، لە دوومەڵی هەڵتۆقیوی سەر روخساری شاری دەکرد و وەکو ئەمیباش رۆژ لە دوای رۆژ گەورەتر دەبوو و زیادی دەکرد.

سەیرم دەکرد و یادوەرییەکانم دەهاتنەوە یاد، گۆڕانکارییەکانیش بە ئاسانی هەستی پێدەکرا. یانزە ساڵ زۆرە، بە تایبەت بۆ وڵاتێک لە تاقە ستراتیژیی کە زۆر بە شێلگیرییەوە هەولی بۆ دابێت، ستراتیژیی سەربازیی، واتە ستراتیژی جەنگ. وڵات هەر هەموو سواری مەکینەیەکی گەورە ببوو کە مەکینەی جەنگیان پێ دەوت. ئەو مەکینانە تا دەکەونە هەرەکەت سەختە،

پاشان بەکەس ناوستێنەوە، پێویستی بە شۆفێریش نامینێت، بە هێزێکی شەوەزەنگ ئاسا دەکەوێتە گەڕ و هەر ئەویش زریزەکانی دەخولێنێتەوە.

من باسی ئەو ئامێرەم وەکو مەجاز بەکار هێنا، بەڵام بە راستی گوێم خڕەی پاچکە گڕنی گڕنییەکانی ئەو مەکینەیە بوو، سەرەتا وامزانی زایەڵەیەکە و بە خەیاڵمدا تێدەپەڕێت، بەڵام کە ئاوڕم دایەوە لە سەر سکەی شەمەنەفەرەکە بوو و لە سەر خۆ و بە قورسایی دەهاتە پێشەوە. شەمەنەفەر نەبوو، بنکەیەکی پۆڵایین بوو، بە ئاسنی حەجۆش دەچوو، دەعامییەکەی بە دڕکی ئاسنین دەور درابوو و مەترێک یا دوو مەتر دەبوو و بە سوورێکی تۆخیش بۆیاغ کرابوون. لەسەر ئەم بنکە پۆڵایینەش، خانوویەکی ئاسنیی بەرزکرابووە و لەملاو ئەولاشی پەنجەرەی زۆر بچووک، تەڵبەند هەبوون کە چاوە نەترووکاوەکانی لێوە دەبینران. لە ناوەندی خانووە ئاسنینەکە، لە لا قەبرغەکانیەوە بازنەیەکی سەوز و لە ناوەندیش تۆپێکی سوور دەبنیرا کە بە خاڵێکی رەش، لە ناوەندەکەی کۆتایی هاتبوو. لە سەرەوەش بە پشتی کیسەڵێکی ئەفسانەیی دەکرد، گرنج گرنج؛ جارجارێکیش دوکەڵێکی بۆری لێوە دەردەپەڕی. لە قەراغ پشتی کیسەڵەکەش دوو لوولە هەبوون بە هی تانک دەچوون و بە دەوری خۆیان دەیانتوانی بخوولێنەوە و بە پێی پێویستیش کورت و درێژ دەکرانەوە. لە سەر دەعامییەکەشی دوو پرۆژەکتەر لە سەر دوو بنکەی کۆڵەگە ئاسا گیر کرابوو، ئەوانیش بزوێنەر بوون و لە شەوی ئەنگوستەچاویشدا، دەیان مەتری پێش خۆی دەکردە رۆژی رووناک. لە نێوان ئەم دوو پرۆژەکتەرەش سێ پیت نووسرابوون (و.ح.ا.). دەهاتە پێشەوە و گرمەیەکی کاسکەری هەبوو. نزیکبووەوە لێم و منیش بە ناچاری دەبوو لە سەر سکەکەی دابەزم و هاتمە خوارەوە. لە هەردوو لاوە، میزەئاوێک و هەڵمێکی بۆن کەسکوونیش دەپرژایە سەر عەرزەکە وەکو تیزاب پێشخۆی دەسووتاند. بە راستی بۆنی کەلاکێکی بۆگەنی لێوەدەهات. جارناجارێکیش زیقەیەکی لێوە دەهات، نەشاز، مێشکی نارەحەت دەکردم.

گوێیەکانم بە هەردوو ناولەپ گرت و موچڕکێکی نامۆش لەشی تەنیم و دونیام لە پێشچاو گۆڕا. عەرزەکەی ژێرپێمی دەهەژاند و بە بوومەلەرزیەک دەچوو، کاتێکیش تێپەڕی ئینجا بۆم دەرکەوت کە یەک مەکینە نەبوو، بەڵکو قەتارە مەکینەیەک بوون و بەرەو سەرەوە لە سەر خۆ، قورس، دەڕۆیشتن.

ئاسۆ سپی بوو، هەستم دەکرد ئاسمانیش نزم بوو، هەندێجاریش باڵندەیەکی نزمەفڕ، وەک بڵێی فەزای ئاسمانی لێ تەسکبووبێتەوە بۆ باڵە بچووکەکانی؛ لە شوێنیک دەگەڕا بۆ نیشتنەوە و داڵدەی دات. ئەگەر بەردێک هەڵدرایە، لە بنمیچی مسینی ئاسمان دەکەوت و بێموبالات دەکەوتەوە سەر زەوی. درەختە کەسکەکانیش بێدەسەڵای دەلەرینەوە. دونیا بە وێنەیەکی فۆتۆگرافی رەش و سپی دەکرد، کۆن و زەردهەڵگەڕاو، بەوە دەچوو کۆچێکی ناوەخت لە گیرفان نووشتاندبێتییەوە؛ درزێکی سپی ناڕێک کردبوویە دوو بەشی ناڕێکەوە. لە سەر ئەم رەسمە رەشوسپییە، باڵندەی جۆراجۆر دەفڕین، بەڵام لە ئاست و ئاراستەی جیاواز، نە گرمە دەیهێشت بنیشنەوە، نەدەیهێشتیش بفڕن. لە دوورەوەش، لە دوا سەنگەرەکانی ئاسۆدا، دوکەڵی چڕ بەرز دەبووەوە، چەشنی گوڕزە تاریکیی ئاسمان قووتی نەدەدا و بە بنیچی ئاسماندا بڵاودەبووەوە. ئەم دیمەنە لە سەر ئیقاعێکی حەزین لە هەموو ئاستەکاندا دووپات دەبووەوە و هەمووی لە ژێر ئاماژەی شێفێکی ئۆرکێسترا مردنیان زیندوو دەکردەوە. چۆن ئەوە بسەڵمێنم کە ئەوەی من دەمبینی خەون نەبووبێت!

نووشتامەوە و مشتێک خۆڵە تەپانیم هەڵگرت و بە هەردوو چنگ پرژاندمە ئاسمانا و وەک غوباری واقیع بارین بە سەرمدا. کەواتە ئەمە خەون نییە، بەڵکو رۆحی غوبارە و دەبارێتە سەرم، ئەمە خەون نییە، بەڵکو لەشی تەپوتۆزە رۆح داگیر دەکات. ئەمە چڕبوونەوەی هەموو غوبارێکە کە لەم هەوارەوە هەڵدەستێت. غوبار و غوبار: غوبارەکەی سەر دەڕابەکەی حاجی قادر و غوبارە بێنازەکانی ئەدیو هەست و غوبارە ناسکەکانی قەد

گەڵای دڕک وداڵ و هی سەر دارقەڵەمتۆزەکەی حەوشەکەی سمایلەسوور و غوبارە هاجەکانی پشتی زاکیرەش.

لە خوارەوەش ئاوی کوڵاو و بۆگەن، ناو ناوە، چاڵە تەڕاییان دروستکردبوو و ئەو ناوە بە تەنەکەی قوپا و نایلۆنی نێو پووشوپەڵاش و کاغەزی بۆری بێڕەنگی لەدڕک گیربوو، قوتووی هەمەچەشنەی بێکەڵک و منیش لە نێو گشت ئەو ئاماژانەی کە لە بۆ مەرگ دەکران، هەنگاوم دەنا. بە خۆم دەوت هەی ئاخر شەڕ بگەڕێیەوە فەرەنسا، چ دەکەیت لەم قەبرسانە گەورەیە؟" گەڕامەوە دواوە، بە کوێدا هاتبووم، هەر بە وێدا گەڕامەوە. گەیشتمە بەر دەرگا گەورەکەی یانەی ئاسووریان، لەوێوەش گەڕامەوە، نازانم بەرەو کوێ دەگەڕامەوە! هەموو شوێنەکان وەکو یەک وابوون.

لە رێگا بیرم لە نووسینی ئەم بیرەوەرییانە دەکردەوە. بەڵام نەمدەزانی بیخەمە چ فۆرمێکەوە و چ شیکلێکیان بدەمێ. هەروەها گاڵتەم بە عەقڵی خۆمیش دەهات. فۆرم و مۆرمی چ. هەموویان وەکو خۆیان چۆنن، ئەوها دەیانووسمەوە. هەر بەردەو لە شوێنەکەی خۆی دادەنێمەوە. ئا ئەمەیە کاری من. ئەم بوومەلەرزەییە دەنووسمەوە کە ئەم شارەی هەژاندووە. باس لە حاڵەتی

هەڵتەکاو دەکەم، باس لە جەستەیەکی شیرازە تێکچوو دەکەم، نەخشەی شێواوی جەستە رەسم دەکەم، برینە دەمهەراشەکانی روخسار دەکێشم. لە کۆتایی دا باس لە روخساری خۆم دەکەم. باسی ئەو درزانە دەکەم کە لەو دیوارانەوە هاوار دەکەن. باس لەو چڵکاوە مەلوولانە دەکەم کە کەس نایانبینێت. باس لە قڵیشانی پەنجەرە لە بۆ دەرگا دەکەم. باس لە تاسانی پێکەنینی منداڵێک دەکەم بەرامبەر بە ویژدان. من لە کۆتایی دا باس لە رۆحی پەژموردەی غوبار بۆ خودا دەکەم. واتە بۆ ئاسمانە بێ زایەڵەکان!

کێ لەدرەوە بوو؟ ناو بە ناو پیرەژنێک یا منداڵێکم دەبینی، یا تارماییەک بە بەر دەرکی سەرای خەیاڵدا تێدەپەڕی، خۆیان ئاشکرا دەکرد و ئاوا دەبوون. روخسارەکان قوپاو، لەشەکان هەندە باریک، دەتوانەوە و وەکو

سەراب لە بەر رۆشناییدا دەلەرانەوە؛ هەندیجاریش تێکدەشکان و دەبوورانەوە. جارناجارێ ئوتومبێلێکی سەربازیی بە خێرایی تێدەپەڕی و هاوارێکی ناڕێکیش بەرز دەبووەوە و ریتمەکانی دەشێواند و شتە راکردووەکانی لە ژێر چنگم دەڕفاند و دووریيەکی دیکەی دەدایە بەرجەستەکان. نەمدەتوانی وێنەیەک بگرم نەشێواو بێت. هەستم دەکرد ئارکیۆلۆژم و خاکی کۆنی ژێر پێم لەقە، لەسەر رۆخی زرەیایەکی لمین دا ئاوە شێتەکانی قووتم دەدا. هەولی زۆرم دەدا و شتە راکردووەکان هێور کەمەوە و هەموو هەوڵ و تەقەللاکانم بە فیڕۆ دەچوون. ئەم وێنە تێکچڕژاوانە خۆیان بە هەست و نەست و عەقڵمەوە دەگرت.

بە بازاری قۆریەدا تێدەپەڕیم. قۆریە یەکێکە لە بازارە کۆنەکانی شاری کەرکووک، بازاری سەوزەفرۆش و میوفرۆش و گۆشتفرۆش و ئیتر وەکو هەموو بازاڕێکی رۆژهەلاتی، بۆن و رەنگ و هاوئاوازییەکی ئەنارشیستی خۆڕسک تێکەڵ بە ئەتمۆسفێری بازار دەبوون. شووتییەکان بەریز دانرابوون، لە پشتەوەش کاڵەکی نۆ مانگیلەی زەرد. دوکاندارەکانیش ئاشبەتاڵیان لێکردبوو. دوکاندارێکم بینی دوو قەف سمێڵی ئەستوور لە ژێر لووتێکی پان و کورت و ناوچەوانێکی پان و لۆچاوی. منیش بەرەو رووی چووم و سلاوم لێیکرد. پێش ئەوەی دەستی سلاوم بەرزکەمەوە. هەستم کرد بە هێما پێم دەڵێت "*باشترە بڕۆیت و رێگای خۆت بگریت*". منیش وەکو ئەوەی نەمەوێت لە هێماکەی تیبگەم و خۆم لێی نزیکردەوە و پێم وت:

– کاکە شووتیم دەوێت، شووتی.

– کورە شووتی چ هەی نەگبەت! ئەی نازانیت شار بار دەکات، بار بە شار دەکەن؟

سەرەتا تێنەگەیشتم. پێش سێ رۆژ لەمەوبەر کە هەولێرم جێهێشت، کەس پێی نەوتم کە شار بار دەکات. دەبێت شتێکیان لێ شاردبێتمەوە، دەبوایە یەکێک لە گەڵ خۆم بهێنم. لە وەزعی ترسناکی وا دا پێوستی دەکرد بە تەنها نەبم. کاتێک لە سەیتەرەش پەڕیمەوە، پێشمەرگەکان داوای

پسوولەیان لێکردم و منیش دامنێ، بۆ ئەوان پێی دەچوو هیچ شتێکی وا لە گۆڕێ دا نەبێت و جێی مەترسی نەبێت. یا ئەوەتا من، دوای ئەو چەندین ساڵەی دوورکەتنەوە، توانای ئەوەم نەمابێت بە باشی لە شتەکان بگەم و ئاماژەکان بخوێنمەوە، یا ئەوەتا بە هەڵە لێکیانم دابێتەوە. کاتێکیش گەیشتمە سەیتەرکەی کەرکووک، ئینزیباتێک داوای دەفتەری خدمەی لێکردم و سەیرێکی ئەمنەکەی تەنیشتی کرد و سەیرێکی منی کردەوە و پێی وتم:

- بەڵلا هاذا عێراقی؟

بۆ ئەوەی گۆمانەکە بڕەوێنمەوە، منیش هەر بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوە:

- ودەعتەک عێراقی!

به شێوەزمانەکەم ئەوەیان لە لا ساغ بووەوە کە خەڵکی ئەو ناوچەیەم. هەردووک دایانە قاقای پێکەنین و دەفتەر خدمە نووشتاوەکەیان دامەوە.

هەستم دەکرد کە شتێک زۆر نا ئاساییانە خۆیم پێ دەناسێنێت. پێی دەچێت هەموو ترسەکان لە یەک پنتدا کۆبووبێتنەوە و خەریک بن تێمدەئاڵێن. کابرای سمێڵ ئەستووری شووتی فرۆشم جێهێشت و کەوتمە سەر ئەو جادەیەی کە بە دەستی راست چاخانە بەناوبانگەکەی ئەحمەد ئاغایە و بە دەستی راستیش شەقامی جمهورییە. چاخانەی ئەحمەد ئاغا شوێنی کۆبوونەوە کرێکاران بوو. کرێکارانی شار و ئەوانەی لە گوندیشەوە دەهاتن، لە بەردەم ئەو چایەخانەیە رادەوەستان و بازوویان دەفرۆشت. بەیانیانی زوو دەیان عارەبانە لەوێ رادەوەستان. بازوو ماندووەکان لە ناوچەوانی وەستاکان رادەمان. چ وەستایەک کێ دەبات؟ مەتەڵی هەموو بەیانییەک بوو. بۆن و بەرامەی هێلکەی کوڵاو نۆکی تلیساوەی ناو کاری و بیبەری تیژ، جگەری برژاو، سەموونی کونجیداری و سیپەلکی کوڵاوی ناو پیازاو و نانی عاشە، ئەم بۆنوبەرامەیە بە یەکسانی بە سەر کرێکار و مەقاول و وەستادا بڵاودەبووەوە.

کاتێک گەیشتمە بەرامبەر جایەخانەکە، کابرایەکم بینی، بەرامبەر بە عارەبانەیەکی جێهێڵراو دانیشتبوو. بە شێوەیەک دانیشتبوو دەتوت رۆحی لەبەر نییە، بەو پەیکەر مۆمانەی دەکرد کە لە هەندێ مۆزەخانە دادەنرێن. سەیری بەتاڵییەکی بێسنووری دەکرد. هەموو لەحزەکان لە نێو تەماشاکانی قەتیسمابوون. ئەو نغرۆی ئەو تەماشاکردنە بوو و منیش جێمهێشت. لەحزەکان چر بوونەوە، باسی هەڵوەشانەوەی گەلێ شتیان دەکرد. پەڕیمەوە بەرەو گەراجی عەرەبانچییەکان کە چایەخانەی جەرجیسی لێبوو و پشتی چاخانەکەشی حەوشێکی هێمن و چۆلەکە و پاساری گۆڕستانەکەی بەرامبەری دەهاتن لەوێ دەنیشتنەوە. لە هەمان حەوشە، ئەسپەکان دەحەسانەوە. ئەسپێکی کلک ئەستوور خەریکی ئالیک خواردن بوو و کلکە ئەستوورەکەشی بە راست و چەپ با دەدا و میش و مەگەزی پاس دەکرد. کاتێک سەیری دەکرد، عارەبانچییەکی جەمەدانی لەسەری توند بەستراوت دەهاتەوە یاد، ناوچەوان لەبەر هەتاوە رەشداگەڕاو و کڵاوێکی خەتخەتی زەرد و سپی، لە نێو جەمەدانییەکەوە قووت بۆتەوە.

لە ئەسپەکە نزیک بوومەوە. ئەسپێکی بەهێز و پتەو، چاوەکانی چرووسکەیان دەهات و حەزی دەکرد مێغزنجیر و ئالیک بەجێبهێڵێت و بکەوێتە غارغارێن. دەستێکم بە پشتیا هێنا و بەجێمهێشت. گەڕامەوە و پێش پەنجەرەکەی چایەخانەکەی جەرجیس. بە هەردوو دەست ئەملاو ئەولای چاوم گرت و سێبەرم دەکرد و لووتم ختم کردە سەر جامی پەنجەرەکە. مێز و ئەسکەمبیلەکانم بینی بە نارێکی هەندێکیان کەوتوون و هەندێکیشیان توێژێ غوباریان لەسەر کۆبۆتەوە. نێرگەلەیەک کەتووە. توێکڵە گوڵەبەڕۆژەی قرتاو و ئاغزەجگەرە و چای رژاو عەردەکەیان داپۆشیبوو. کاشییە قاوەییەکە رەنگە ئەسڵییەکەی دیار نەبوو. سولاحییەکی فافۆنی قوپاو لارببووەوە و ژێرپێاڵەیەکی شین هورد و خاش ببوو. لە قەد دیوارەکەش پۆستەری فوتبۆڵین و رەسمێکی پێلێ هەلواسرابوو، لەسەر رەفەکەش چەند جامێک دانرابوون.

شتەکان بە تەنها دەدوان. بەڵام دەبوایە ئەویش جێبهێڵم.

ماڵی ئێمە دەبێت بۆ کوێ باری کردبێت؟ ئەوا سێ ڕۆژ کۆتایی هات و نە گەڕەک دەمناسێتەوە، نە ناسیاوێک ڕێنماییەکم دەکات، نە دەرگایەک دەکرێتەوە، نە حەوشێ ئاوەڕشێن دەکرێت!

## ڕەحیمئاوا

پشتم لە خانووەکانی بەگلەر کردبوو و هەستیشم دەکرد درەختێکی گەورەم و لە ڕەگەوە هەڵکێشراوم. سەیری قەد و باڵای خۆم دەکرد؛ ئاوێکی لینج، هی شەونخوونی بە لەشما چۆڕەی دەهات وپێیەکانم بە قورسی دوام دەکەوتن. بە ماندوویش پێڵووە قورسەکانم دەکردە و وێنە لێڵەکانی خانووە قوڕینەکانی ڕەحیمئاوا، دەردەکەوتن.

دوێنێ شەو بە ماندوویی نوستم، ئەم سەرلەبەیانییە بە ماندوویی لە خەو هەڵسام. خەو مەودای زەمەنی کورت دەکردەوە، بەڵام نەیدەتوانی حەسانەوەیەکی پڕ بە پێستی ئەو ماندوونەی ئەو چەند ڕۆژەم بداتێ. دەنووستم، بەڵام ناهۆشیاریم وریا و ئەو کاری لە جیاتی من دەکرد، لە جیاتی من کاری دەکرد و لە جیاتی من لاپەڕەی ڕۆژگارەکانی بۆ هەڵدەدامەوە. ڕەحیمئاوا زۆر شتی پێ دەوتم، بەشێک لە منداڵیم و مێردمنداڵیم لەوێ دەبردە سەر. ماڵی نەنکم لەوێ بوو، ویستم هەنگاوە ماندووەکانم سێبەرە کەڵەکەبووەکان لە خۆی بتەکێنێت.

ماڵی نەنکم لە ڕەحیمئاوای نوێیە، لە سەر بەرزاییەکانە، بەرامبەر

بە گڕە هەمیشەییەکانی باوەگوڕگوڕە، بۆیە شەوان دیواری پشتەوەیان وەکو مس سوور دەبووەوە. ڕەحیمئاوای کۆن و نوێ بە جادەیەک کەرت ببوو و هەروەها ببووە بازاری ڕەحیمئاوا. بازاڕێک و مزگەوتێک و تەپوتۆزێکی زۆریش ئێواران کاتێک هەتاو ئاوا دەبوو، زەرراتەکانی دەکەوتنە

بەر تیشکی هەتاو. "مام رەحیم" یەکەم خانووی دروستکرد، تا حەفتاکانیش مابوو، پشتکۆم عەسران لەبەر هەتاوەکە، لە ژێر نمانەکە دادەنیشت و سەیری مەملەکەتە ئاوەدانەکەی دەکرد.

بە ماندوویی هەنگاوەکانم دابووە دوای خۆم و بە خۆمم دەوت رەنگبێت بەسەرکردنەوە ئەم خانوو و مالانەی، هەندێ تیشک بخەنە سەر ئەم عەودالبوونەوەم و هەوالێکم لەمەڕ مالی خۆمانەوە دەسکەوێت.

سەرەتای رەحیمئاوا بۆ من دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شەستەکان، وردتر، ناوەندی شەستەکان. بناغەی مال لە ئەشکەوت و رەشماڵەوە دەست پێدەکات.

دوای ئەوەی ئێمە زەردک بەجێدەهێڵین، لە خانووە شێدارەکەی سەر پشتی قەلا بە شێوەیەکی کاتیی دەگیرسێینەوە، مالی نەنکم لە بەرزاییەکانی رەحیمئاوا، پاشان دەبێتە رەحیمئاوای نوێ، رەشماڵێک هەڵدەدەن. ئەمە بۆ زۆربەی خێزانە هەلاتووەکانی گوندەکانی شوان و ساڵەیی دروست بوو: زەردک و بیبانی و سەربیر و یارمجە و حەسارمەحەتە و تۆراغ و عەمدوون و ئۆمەر مەندان و هتد. ئەوانیش کەوتبوونە بەر لێشاوی حەرەس قەومییەکان و لە دەستی پەتای ئینسانی رایانکردبوو. رەحیمئاوا لە راستی دی گوندێک بوو لە پەراسووی کەرکووکەوە چەکەرەی دەکرد. دەستێکی لە سەر شانی کەرکووک و دەستەکەی تریشی گوندەکانی دەلاواندەوە.

نەنکم ژنێکی گەنمرەنگ و باریکەلانە و چاوتیژ و لووت باریک و تەمەن مامناوەند بوو. ئەو کات دەبوایە بە دیار چوار منداڵەوە دانیشێت تا پەڕوباڵ دەردەکەن.

لە راستیشدا، رەشماڵەکە جۆرە کەپرێک بوو، سێ دیوار و دوو ریز چینکۆ و دەرگایەکی شلۆق و هیچی دیکە. لە ژوورەوەش تەباغێکی یەکچاو و مەنجەلێکی گەورەی فافۆن و هەندێ بوزگور کە بە ئاسانی لە سیپاڵ جودا نەدەکرانەوە. ئەمە جەو و ئەتمۆسفێری ماڵ بوو. رەنگ پەڕیو، تەمەن وەریو، وەک بەیداغەکانی لەشکرێکی شکاو، لە بەر بایەکی هاج دەشەکایەوە. بای

دەرەوەش تیشکی کزی فانۆزەکەی ژوورەوە دەخستە پرتەپرت، بەرجەستەی دەدایە ژیان. چونکە کاتێک کە با دەلوورێنێت، لە کوێیەوە دێت، لە دەشتاییەکانی باکوورەوە، لە چیاوچۆڵ و بەرزاییەکانەوە، ئەوانیش کەوتبوونە بەر هێرشی رشانەوە. ئەم سروشتە زیندووە منداڵدانی بایە، هێرش دەبا و وەکو بڵێی دەیەوێت تۆڵەی خۆی لە داروبەرد بکاتەوە. ئەم جەستە نەبینراوە کە هێرش دەکات رەنگبێت بۆ ئەوەی بیەوێت، چینکۆکانی بنمیچ لە بنەوە هەڵتەکێنێت و نایلۆنە پەرپورتەکانیش بخاتە سەر ئاوازێک سروش ببەخشێتە سەمۆنفیا جەنازەییەکان. ئاوازی دەم ئەجندە کۆبووەکانی نێو زەردک و یارمجە بوو، رچە دەسلێوەشاوەکانی حەکایەتە بێکۆتاییەکانی شەوانی زستان.

چوار منداڵ لە دەور تەباغێکی سەوزی چوارگۆشە کرۆشکیان دەدا. وەنەوز و ماندوو بوون لەشیانی دەغەزارکردبوو، بێدەنگ، رووناکی فاۆنۆزەکە روخساریانی دادەتاشی و لە پشتەوەش لە سەر دیوارەکە سیبەرکان وەکو قەرەقۆز بە بێ داوە وەهمییەکانیان دەکەوتنە سەما. رووناکی بە نایەکسانی ئەو ژێر کەپرەی رۆشن دەکردەوە و شەوی ئەنگوستەچاویش دەمێکە سیمای باروبارگەی خۆی لە حەکایەتاکانەوە قۆزتبووەوە، ئەگینا ئاسمانی رەحیمئاوا لە ئەزەلەوە، لە لای ئاسۆکانەوە سوور دەچێتەوە، کاتێک هەوری بەهار و زستانیش گرد دەبنەوە، بڵێسەکانی باوەگورگور ئاسمان وەکو تەنوور دادەگیرسێنێت.

بۆیە کاتێک لە سەر بان، شەوانی هاوین خێزانەکان لە دەوری سەماوەرێک دادەنیشتن و شووتی و کاڵەکی فێنکیان دەخوارد، هەموو روخسارەکان وەکو قوڕی سوورەوە بوو هیواو و خەمی لێوە دادەچۆڕی.

حەوتەم کۆڵان بە دەستی چەپ و پێش ئەوەی بگەیتە کۆتایی کۆڵانەکە ماڵی نەنکمە. بە دەستی چەپیش کۆشکەکەی مام قازییە کە لەسەر قەرەوێلە ئاسنینەکەی کاتێک پاڵ دەکەوت، دەتوت چنارێکەو راکشاوە، دوا ساڵەکانی تەمەنی بە ژیریی و حیکمەتەوە دەبردە سەر. کابرایەکی کەڵەگەت، رەقەڵانە،

ڕۆژگار جێی پەنجەکانی خۆی بە جوانی لەسەر سیما و ڕوخساری جێهێشتبوو. لۆچەکانی سەر تەوێڵی، لۆچەکانی دەروبەری چاوی هەند بە کارامەیی کێشرابوون، دەتوت ڕۆژگار پەیکەرتاشێکی بلیمەتە بۆ هەندێ ڕوخسار. ئەم لۆچە ڕێکوپێکانە ئەنجامی ئەزموون و تەجرەبە دەولەمەندەکانی ژیانە. ئەگەر بە وردی لێیان رامایتایە، بە ئاسانی دەتخوێندنەوە. لە کۆتاییدا، سیما ئەو کتێبەیە کە ئەزموون دەینووسێتەوە. هەر هێڵێک مەقامێکە، هەر خەتێک رازێکە دەچێتە نێو لۆچەکانی رابردووەوە.

مام قازی بە نووستنیشەوە لە هەیبەتی خۆی کەمی نەدەکرد. ئەمەش خەسڵەت و سروشتی ئەو جۆرە هەیبەتانەیە کە خۆرسکن کە مردنیش ناتوانێت چۆکیان پێدا بهێنێت. ئەم هەیبەتە ترس بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو ڕێز و خۆشەویستی و لە کۆتایی ملکەچی حیکمەتێک دەبین کە دەسەڵاتی ئاسایی خۆی فەرز دەکات و کەسیش خۆی ناکاتە خاوەنی.

دەمەوعەسران، حەوش ئاوەڕشێن دەکرا، باخچە قنجەکە ئاودەدرا، بۆنی ڕەشەڕێحانە و گوڵەباغ زاخاوی مێشکی قازییان دەدا و دەگەشایەوە. هێمن هێمن بەرەو مەرگێکی بەختیار تەمەنی خۆی دەپێچییەوە. لە حەوشە لاکێشەییەکە سێ و چوار شوێن هەبوو بۆ دانیشتنی ئەو. مام قازی بە پێی هەتاو جێگۆڕکێی بە شوێنەکانی دەکرد. سێبەرەکانیش وەکو یەک نەبوون. سێبەری چێشتەنگاو بەرەو کاڵیی دەچێت و سێبەری عەسرانیش بەرەو ئەستووریی. یەکەمیان وردە وردە گەرم دادێن و دووەمیشیان فێنک.

سێبەری چیشتەنگاو خیانەت لە هەتاو دەکات، تا دێت وەکو گوڵەبەڕۆژەیەکی ئەفسانەیی شەق دەبات و ملیۆنەها وردە هەتاوی لێ جودا دەبێتەوە. هەست دەکەیت سیبەر لە بێژنگێکی هەتاوین دەدرێت. سێبەری عەسرانیش ئاوێتەی بۆن و بەرامەی باخچەکە دەبێت و تا ئێوارەش زیاتر بە نێو شەودا ڕۆ دەچێت، هەندەی تر لەززەتی دانیشتن و گوێگرتن زیاد دەکات.

کاتێکیش ئێوارە وەکو ئاژەڵێکی نێرینەی یاڵ چڕ، بە پێ دزە خۆی لە حەوشەکە نزیک دەکردەوە، قازی وەکو میری داستانەکان دەهات و لەسەر

عەرشە ئاسنینەکەی چوار مشقی لێی دادەنیشت. هێمن هەر وەکو بۆنی ڕێحانە. سەرەتا پاڵدەکەوت و سەر خەوێکی دەشکاند، تا زریکە و زورپ و هوڕی خوشکەزا و برازا و کوڕەزا لە خەویان دەکرد. ئیتر هەڵدەستاو بە چاوە زیتەکانی تێبینییانی دەکرد و دەیڕوانی و بە رستەی کورت و پڕ ماناش تەمێ و ئامۆژگاری دەکردن و هەندێجاریش توڕە دەبوو. بەڵام توڕە بوونی ئەو، حیکمەتی خۆی هەبوو.

بەیانیانیش کاتێک بە پەیژەکانیدا، لە کۆشکەکەیەوە دەهاتە خوارێ و خۆی دەچەماندە سەر گۆچانەکەی و بە هێواشی دادەبەزی، هەرگیز هەستت بەوە نەدەکرد کە رۆحی قازی ملکەچی ئەم دانووشتاندنەوەیە بێت. بۆ ئەوەی بە تەواوی روخسار و سەروسیما و مێزەرە توند بەستراوەکەیت بە باشی ببینایە، دەبوایە بە تەواوی سەرت کەمێ بەرز کەیتەوە.

قازی لە جیاتی موختار بەکاردەهێنرا. ئەمەش هەڵبەتە دەلالەتی خۆی هەبوو، دیارە لە موختارێک زیاتری پێکراوە. کاتێک لە قادر زەمە دەبێت، کاروباری کۆمەڵایەتی ئاوایی و بڕیار و نەخشەکانی بە بێ پرسی ئەو ئەنجام نەدراوە، بەڵکو هەمیشە بڕیارەکانی لە ناوەندەوە چارەسەر دەکرد. بە زیرەکی و ژیرییەوە دەیڕوانییە کاروباری دونیا. ئەوانیش لە کۆتایی شەستەکان دێنە رەحیمئاوا، لەوەوە کۆشێ منداڵ و لە منداڵەکانیشەوە کۆشێکی تر. ئەمە دونیایەک بوو تایبەت بە قازی.

لە رووی ئاینیشەوە هەندە زۆر پێی لە شت دانەدەگرت. ئەگەر بۆ هەندێ کاروبار هیشکی بنواندایە، بەڵام لە باری ئاینەوە مێشک کراوە و لە سەرخۆ بوو. تا مرد نەچووە حەج! هەینییان زۆر بە دەگمەن دەچووە پشت ئیمامەوە و گوێی بۆ راوێژ و خوتبەکانی رادەگرت. بڕوا و ئیمانی ئەو سادە و ساکار بوو. بە بێ هێچ پێچ و پەنایەک: لە دڵەوە بۆ دڵ. بڕوای وا بوو کە خودا، دروستکەری دوو دونیا، نابێت لە دەرەوە دونیای ئێمە بێت. ئەگەریش لەم دونیا بێت، نابێت لەو دونیایە نەبێت، بە کورتی دەیوت نابێت لە شوێنێک بێت و لە شوێنێکی دی نەبێت. بە کورتی بە نیسبەت قازییەوە، خودا وەکو هەوا

وابوو، هەموو شوێنێکی بەسەر دەکردەوە. ئەگەریش دەربارەی ماڵی خودا لێیان بپرسیایە، ئەوە بە کوردی پەتی و نووکی گۆچانەکەشی بۆ شەتڵە ڕێحانەکان درێژ دەکرد و دەیوت ماڵی خودا لەوێشە. ئەگەریش زیاتر بچویتایەتە نێو بنچوبناغەی شتەکانەوە ئەوە دەیوت پێویستە ڕێزمان بۆ شەتڵە ڕێحانەیەکیش هەبێت و بۆنەکەیمان پێ خۆش بیت و تۆوەکەی بۆ ساڵی ئایندە هەڵگرین، ئەم بۆنە لە نەوەیەکەوە بدەینە نەوەیەکی دی.

زۆرجار، وەکو دەنکە تەزبێحی ترازاو، نوێژەکانی کۆ دەکردەوە و لە بەر سێبەرەکە، هەر بە دانیشتنەوە، هەمووی پێکەوە دەکرد و هەموو پێکەوە دەهۆنییەوە. لەو ڕووەوە دەیوت خودا وەکو ئێمە حسێب ناکات، ئەگەر یەک و یەک بۆ ئێمە بکاتە دوو ئەوە بۆ ئەو ڕەنگە بکاتە سفر. هیچی ئێمەش ڕەنگە بۆ ئەو زۆر شت بێت. دەیوت خودا گەورەیە و ئێمەش خاوەن ئیرادەیەن. نابێت دوعاکانمان پاڕانەوە بێت بۆ ئەوەی خودا لە نەخۆشی بمانپارێزێت، ئیفلیجمان بۆ چاککاتەوە، قاسەکانمان پڕ گەوهەر و پارە کات، دەیوت ئەم جۆرە خودایانە هی ئەو کەسانەیە کە ئیرادەیان نییە. دەبێت دوعاکانمان داوای تێدا نەبێت، بەڵکو دوعای بەخشەندە بن، واتە دوعای خۆڕایی. قازی زۆر کەم باسی دۆزەخ و بەهەشتی دەکرد. دەیوت ئێمە هیچ شتێک دەربارەی سزا و پاداشتەکانی خودا نازانین. ئەوەشی وتراوە بۆ تۆقاندن بووە، خوداش پێویستی بە تۆقاندن نییە، چونکە ئەو ئینسانی تۆقاوی خۆش ناوێت. ئەگەر بۆ تۆقاندنی خەڵک ئەم دوو دونیایەی دروست کردبێت، ئەوە ریسەکەمان دەبێتەوە خوری. ئەوەی گرینگە هەوڵ بدەین بە وشەی ئاسایی باسی خودا نەکەین، چونکە وشە خودا بەرجەستە دەکات و هەروەکو خۆشتان دەزانن خودا بەرجەستە نابێت. بە هێمنییەوە سەیری دونیا بکەن و لەو شەتڵە ڕێحانەیە وردبنەوە و دونیاتان خۆشتر بوێت، چونکە لە دونیایەکی وێرانبوو، خودا بە زەحمەت خۆی نیشان دەدا.

کۆشکەکەی دوو پەنجەرەی هەبوو، یەکێکی دەیڕوانییەوە حەوشەی خۆیان و دانەکەی تریش دەیڕوانییە حەوشەکەی تەنیشتی، بە چاوێکی

باوکانەوە سەیری کەپرەکەی دەکرد و بە وریاییەوە سەیری چوار منداڵەکەی دەکرد کە چۆن هەراش دەبن. هەندەی نەبرد خشت لە سەر خشت دانرا و کەپر دارەراکرا و حەوشێکی لاکێشەیی و ژوورێکی گەورە، نیوەی بۆ مەتبەغ و نیوەکەی تریش بۆ خەوتن. شەوان پێنج دۆشەکی تیا رادەخرا.

کاتێک لە دەرگای حەوشەشەوە دەهاتیتە ژووریٚ، جار نا جاریٚ گوێمان لە بۆڕەی مانگایەکی خۆشەویست دەبوو. بۆڕەی ئەم مانگایە بە باشی نەنکم دەیناسینەوە: بۆڕەی برسیبوون و ناڕەحەتی و کاتی دۆشین و هتد. کاتێکیش نەنکم لێی نزیک دەبووەوە ناولەپی دەساوییە پشت وقەبرغەی، مانگا هەستی بە لەززەتێکی رادەبەدەر دەکردو دەکەوتە کلکە لەق. مانگا: سەرمایەیەکی ئاشکرا بوو. ماستە شیرینەکەیان هەموو سەرلەبەیانییەک دەفرۆشرا: پەنجا فلسی رێکی دەکرد.

ئەم مانگایە ئاژەڵێکی هاکەزایی نەبوو، بەڵکو مێژوو و ئەو و مێژووی خیزانەکە تێکەڵ دەبوون. ئەگەر لە چاوە حەلواییەکەی ورد بویتایەوە، کۆچ و بەسەرهات و لێقەمانەکەی شەست و سیٚ لە دوو توێی چاوەکانیا دەخوێندرانەوە. بە تایبەت ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە خێزانەکەی ئێمەشەوە هەبوو. واتە پەڕینەوە لە زیٚ و چوون بەرەو دەشتاییەکانی دزەیی.

ماڵی نەنکم و ئیمە پێکڕا لە زێمان دا. گوندی تولکیمان لەو شەوە ئەنگوستەچاوە پێکڕا جێیهێشت. ئەو شتانەی کە من لە بیرمە، مەرج نییە ئەم مانگایە هەمان شتی لە لای خۆی تۆمار کردبێت. ئەگەر بە وردی سەیری چاوە گەورەکانی مانگاکەت بکردبایە، باسی زۆر شتی دەکرد و شتگەلێکی تۆمار کردووە کە کاتی خۆی هیچ گرینگییەکی ئەوتۆی بۆ من نەبووە. ئەمە بۆ ئینسانەکانیش راستە، برادەرانی قوتابخانەی سەرەتایی یا ناوەندی کاتێک، دوای دە دوانزە ساڵ دەگەنەوە یەک، هەموویان باسی یەک شت ناکەن، هەندیٚ بەسەرهات بۆ یەکێک گرینگ بووە و بۆ یەکێکی دی، بەسەرهاتێکی دی.

ڕەنگە ئەم مانگایە حەز بکات بەسەرهاتەکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان بگێڕێتەوە. جۆرە ئینتیباعێکی سەرەتایی لە چاوەکانییەوە شەپۆلی دەدا:

*(دەمەو عەسران بوو، یەکێک هات و مێغنجیرکەی لێکردمەوە. من خەریکی لەوەڕین بووم، من هەمیشە، یا خەریکی لەوەڕینم یا کاوێژ دەکەم یا پاڵکەوتووم. ئەم مێغزنجیرلێکردنەوە بۆ من بێوەخت بوو. ناوقەدی گوریسەکە لە عەرز دەخشا. هەندەی نەبرد ئەسپێکی سپی خاڵخاڵ و گوێدرێژێکی ئاسایی پەیدا بوون و حەشاماتێکیش دەوریان لێمدا. وردە وردە لە ئاوەدانیی دوورکەوتینەوە. تێکەڵ بە ئێوارە بووین. ئەسپەکە لە پێشەوە و گوێدرێژەکە و من زۆر لە یەکترییەوە دوور نەبووین. ئەسپەکە گورج بوو تەبعەن. دوو منداڵیان خستبووە سەر پشتی ئەسپەکە و کچ و کوڕێکیش لە سەر پشتی گوێدرێژەکە بوون و کەرانە ڕەوتی خۆی دەکرد. منیش وەکو مانگا سەرەتا نەمدەزانی مەسەلە چییە. مێشە سەگانەم بە کلکم پاس دەکرد و وەکو شاژنێکیش بە تەنیشت کاروانەوە هەڵتەک هەڵتەکم بوو. گوێدرێژەکە جار ناجارێک قەپاڵی لە پووش وپەڵاشی ڕێگا دەدا، گیاوپووشی تفتی ئەو ناوچەیە بە نارێکی لەملاو ئەولای ڕێگایە شین ببوون. هەستی بە دژواری ئەم سەفەرەی نەدەکرد، بەڵام قەپاڵەکانی زۆر ئاسایی بوون. پەتکەکەی منیان بە دەستەوە بوو. ئەو گوندەی کە بەجێمانهێشت توڵکییان پێدەوت. ناوی گوند چ گرینگییەکی بۆ من هەیە، لە هەر کوێ جێی حەوانەوە و گیاوگۆڵ هەبێت، من لە شازادەیەک بەختیار ترم. لە توڵکی ژیانم خراپ نەبوو، هەیوانێکم هەبوو بۆ حەوانەوە و بە باوەشیش پووش و پەڵاشیان بۆ دادەنام. دەمەو عەسرانیش، دوو منداڵ پێکەوە یارییان دەکرد، یەکێکیان کەرتە موقناتیسی پێبوو، دەیکردە گالێسکە و پاسکیل و ئۆتۆمۆبیل، دەیکردە فڕۆکە، دەیکرە هەموو شتێک کە خەیاڵی ڕێگەی پێ بدایە. سەرەرای هەموو شتێکیش، هەستم دەکرد مانەوەم لەو شوێنە کاتییە. بۆنی سەفەر دەهات. چۆلەکە هەڵدەفرین. جموجۆڵی دانیشتوان ئاسایی نەبوو. نەغمەی دەنگەکان*

*نەغمەی سەفەر و کۆچ و نادیارییان لێوە دەهات. کێ دەزانێت نەغمەی کۆچ چۆنە؟*

*لە ئاوایی دوور کەوتینەوە. دوو توولە ڕێ هەبوون، یەکێکیمان گرتە بەر. دەنگی قاپوقاچاغ دەهات. دونیا بەرەو تاریکبوون دەچوو. هەندەی نەبرد پڕ بە لووتم بۆنی ئاوم کرد. خوڕەی ئاو بوو دەگەیشتە پەردەی گوێیەکانم. گوێیە پانەکانم بە ڕاست و چەپ با دەدا و دەمویست لە نهێنییەکانی ئاو تێبگەم. بۆنی ئاو دەهات و بۆنی سوێش دەهات. یەکێکیان شین و سازگار و پێویست، ئەوی تریان خۆڵەمیشیی و سوێر و مردوو. لە نێوان ئەم دوو بۆنەدا کە لە ئاسمان تێکەڵ دەبوون، بۆنی دەیان بۆنی دیکە، وەکو تەونێکی تیژ، ئاسمانیان بریندار کردبوو. لەو بۆنانە، بە باشی بۆنی راکردن و بۆنی وێرانیی و بۆنی شیوەن و بۆنی فرمێسک و بۆنی دڵەراوکێی و بۆنی تەسلیمبوون و بۆنی مەرگیش بە ئاسانی جودا دەکرانەوە. بۆنی مەرگ لە سەروو هەموو بۆنەکانەوە سیا ڕەشماڵی خۆی هەڵدابوو بۆ داڵدەدانی بۆنەکانی دی. مەرگ هەموو شتێکی داڵدە دەدا.*

*چی ئەو هەموو بۆنانەی بە پێش کوونە لووتمان دەهێنا؟ با بوو یا گریانی ئاو؟ دونیا لە نێو شینییەکی مۆر دەچووەوە. ئێمەش لە دوور ڕا، لە تۆپەڵە ڕەنگی بۆز دەچووین، تۆپەڵەرەنگ بووین و کۆچمان دەکرد. هەتاو دەمێک بوو ئاوا ببوو، ئەویش بۆ قووڵاییە تەڕەکان شۆڕ ببوەوە. لە پێش ئەسپە گوێ قوتەکەش سێ مێردمنداڵ کە نە پشتی ئەسپ و نە پشتی کەریان بەرکەوتبوو، بە پێ لە حەشامات دوور دەکەوتنەوە و لە شوێنێک دادەنیشتن تا دەگەیشتینە لایان. بەمجۆرە دەحەسانەوە! جارێکیان بە هەراو زەنا گەڕانەوە و باسی*

*بریقەی ئاویان دەکرد. دڵخۆش بوون! ئەوان دلخۆش و باسیان لە بریقەی ئاو دەکرد، واتە باسیان لە مەرگی من دەکرد. واتە لە خنکانی من. ئەرێ پەڕینەوە ئەوان خنکانی منی نەدەگەیاند؟ ترسێکی ئاژەڵانە سوار ئەستۆم بوو، لەشی دەسمیم و لە کۆتایی کلکم هەستم پێی دەکرد.*

گەیشتینە سەر زێ. کەڵەک لە قەراغ ئاو. سەرەتا ویستم یاخی بم، یەک دوو جار خۆم راپسکاند و کەللە زلەکەم بە راست و چەپدا راوەشاند. لمۆزم بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە. قاپوقاچاغ و ئەو کەمە بوزگورەی کە شتومەکی سەفەر بوون، لە سەر قایەغەکە دانران. منیان بە گوریسەکەوە بەستەوە و دەبوایە من بە مەلە بیپەڕمەوە. سەری پەتەکە بە دەستی ئەوەوە بوو. لەشم وردە وردە نوقمی ئاوەکە دەبوو. ئەمە یەکەمجارم بوو کە ئاو بمخواتەوە. یەک دووجار نوقمی ئاوەکە بووم. قیژەیەکی زیقن، بە هی ژنان دەچوو، لە سەر کەڵەکەکە بەرز بووەوە. سەرم لە ئاوەکە دەرهێنا و کەتمە مانگامەلە، نەمدەزانی مەلە دەزانم، بەڵام ئەوەی مەلەم تیا دەکرد، ئاو نەبوو جەحیمی ژیانم بوو. پڕ لووتم ئاو بوو و لە گەڵ چڵمێکی زۆر، هەوڵم دا فڕێی دەمە دەرێ. جارێکی تریش ژێر ئاو کەوتمەوە و لووتە فشەکانم پڕ ئاوبوونەوە. ئەمجارەیان بە هێز سەرم رادەوەشاند و سەر ئاو کەتمەوەوە. چڵمێکی زۆر لەسەر قەپۆزم کۆببوونەوە، شەپۆلۆکەیەک هات و هەمووی پاک کردەوە. بە دەسەسرێکی ئاویی دەچوو. زمانم دەرهێنا و سوێراوەکەم لووشدا. بە زمانێکی دی کوونە لووتەکەی دیم سڕییەوە و ویستم ئەمجارەیان بە تەواوی خۆم راپسکێنم و خۆم تەسلیمی ئاوەکە کەم. لە تاو ترس و سەغلەتی نێو ئاوەکە میزێکی گەرم بەناوگەڵمدا چۆڕەی کرد و بە لێوار و لۆچی قوزمدا هاتە خوارێ و ئاوەکە پاکی کردەوە. هەندەی نەبرد لەوبەر نزیکبووینەوە، دەگەیشتینە قەراغ و پێیەکانم بەر چەگل و لمی قەراغەکە دەکەوتن. هەر چوار پێیەکەم کەوتنە سەر زەوییە تەڕەکە و بەڵام ئاوە تیژڕەوە ساردەکە دەیوست لەگەڵ خوێم بەرێت.

یەک دوانێکیان دابەزین و قایەغیان بەستەوە. جارێکی دیش نەمدەزانی بۆ، دەمویست خۆم راپسکێنم و پڕ بە هەناو بۆڕاندم. ئەمە یەکەم بۆڕەم بوو لە دەشتی دزەیی. بۆڕەیەک بوو کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لەو دۆزەخە ئاوییە رزگارم بوو. گەیشتمەوە ئاوەدانیی. بەڵام ئاوەدانییەکی وشک.

هەتاویش دەمێک بوو لە قورگی کەندڕەکان خەوی لێکەتبوو. هەزارن ئەستێرەش بە دیارییەوە ئەشکیان دەگرت و هەندێکیشیان دۆش دامابوون. لەسەر ئەم هەموو بەزمەشەوە، ئەسپەکە جارێکی دیکە، قیت قیت، وەکو جاران کەوتە پێش قافڵەوە. مام گوێدرێژێش، وەکو جاران ملیٚ شۆڕکردەوە و تووله رێگای گرتەوە بەر. یەکێک لە منداڵەکان، لە گەڵ ریتمی رەوتی کەرەکەدا، ملی شۆڕکردبووە و وەنەوزی دەدا. ئەویش هەتاوی دڵی دەیویست، لە قەد پاڵێکدا، سەر خەوێک بشکێنێت. ژنەکەی تەنیشتی، جار نا جارێک بە نووکە تیرۆگ نەیدەهێشت منداڵەکە بخەوێت، ئەگینا بەردەبووەوە. ئەمە بوو بە ریتمی ئەو شەوە.

ناوەندی ئاسمان بە ئەستێرە داگیرسا بوو. لوورەی گورگ و چەقەڵ و کەمتیار بە باریکیی دەرژانەوە نێو تاریکیی شەوەوە. من شارەزای لوورەی گورگی برسیم، یا ئەوانە لە رەو دابڕاون، یا هی ئەو بێچووانەی کە هێشتا فێری راو نەبوونە، ماندوو ماندوو لە نیوە رێگاکان بە جێماون. لە دوای دایکیانەوە گورگەلۆقەیانە و نێچیرێکی لەڕیشیان بۆ کەڵبە تیژکردن دەست ناکەوێت. بەڵکو دەنووزێنەوە و لوورەکانیان پێش ئەوەی لە دایکبن، دەخنکێن. ئا ئەم نووزانەوانە بوو کە دەرژانە نێو تەنهایی ئەو شەوەوە، تەنها هەوای تاریک دەمایەوە تا بیلێسنەوە. منیش تا هێزم تیا بوو بۆڕاندم و ویستم دونیای بیدەنگ بهێنمە زمان. ئەمە دوا بۆڕەم بوو کە شەوی کۆچ و جریوەی ئەستێرەکان و وەنەوزی منداڵ و بێچووە گورگی بەجێماو لە یەک کاتدا، گوێیان لیٚ بێت.

شەو بە تەواویی دەسەڵاتی خۆی سەپاندبوو. بە تەنیش دوو گوندا تێپەڕین. پێی دەچوو تاڵان کرابێت و خەڵکەکەی بە دیل برابێتن و ئاگریشی تێبەردرابێت. بۆنی سوێ دەهات، بۆنی پەڕوپیتاڵی سووتاو دەهات، بۆنی هەڵکرووزانی مووی پێست دەهات. لە قەراغی گوندیش گوێمان لە حەپەی سەگی برسی بوو. ئەسپەکەش سەری راوەشاند؛ پێی دەچوو بۆنێکی ناخۆش کوونە لووتەکانی تۆزاندبێتەوە. منیش پڕ بە سینەم بۆڕاندم.

*شەو تێدەپەڕی. تریفەی مانگ هەندێ ئاسۆی رووناک کردبووە و دیواری روخاوی لە دیواری دیکەی جودا دەکردەوە. نزیک گوندێک بووینەوە. لە پاڵ دیوارێکی روخاو منیان بەستەوە، هەر لەو پاڵ دیوارە حەشامات لێی خەوتن. شەکەت و ماندوو، ئاواییەکی نوستوو پێشەوازی لیکردین. دونیا خۆڵەمێشین بوو، ئەستێرەکان لە شوێن خۆیان، بە تیری رووناکی دەکوژانەوە. پێش ئەوەی یەکێکیان بکوژێتەوە، لە برسانا، ملم بۆی درێژکرد و ویستم بە قەپاڵێک قووتی بدەم. منیش ماندوو بووم، ئەزموونی ئاو و غوبار. ئەزموونی پەڕینەوە! قەبرغەم لە دیوارەکە دەخشاند و پێڵوەقورسەکانم پەردەکانیان دادیەوە و چۆکیان پێدادام و خەون هەموو ئەزموونەکانی سڕیمەوە.)*

ئەمە جۆرێک بوو لە جۆرەکان ئەگەر بهاتبایە، مانگای بەخشندە و میهرەبان، رابردووی خێزانەکەی بگێڕابایەوە.

منیش جوان دێتەوە یادم چۆن نەنکم لە سەر کەڵەکەکە سەیری مانگاکەی دەکرد و دەیوت: *"یا غەوسی گەیلانی، سوڵتان عەوڵای عارەبی هیچ لە مانگاکەم نەیەت. ئەی پیری ئۆمەرمەندان هاوارە!"*

ئەم بەسەرهاتانە تا ساڵانێک زۆر دەکەوتەوە سەر زاری ئێمەمانان، بە تایبەت کاتێک ماڵی ئێمە و ماڵی نەنکم کۆ دەبووینەوە، قسە قسەی رادەکێشا، تا باس دەگەیشتە باسی گەڕەشێخان و بەسەرهاتەکانی ئەو ساڵانە. باسی بەردە سپییەکەی دەشتی حیجاز دەکرا و کەس نەیدەزانی ئەو بەردە بێگەردە کەوتە کوێ. وابزانم وەزیفەی ئەو تەواو بوو و بە تەواویی چووە نێو لۆچەکانی لەبیرچوونەوەوە. هەروەها باسی مانگاکە و کەڵەکە زۆرجار بە پێکەنینەوە دەکرا.

بە دەم رێوە ئەم بەسەرهاتانە بەسەر دەکردەوە. خەریکبووم لەو جادەیە دەپەڕیمەوە کە هەردوو رەحیمئاوا لێک جیادەکاتەوە. هەندێ دوکان کرابوونەوە، ئەوانی دی هەمووی دەرابەکانیان دادرابوونەوە. هێشتا تەواو نەپەڕیبوومەوە، عارەبانەیەک، گوێدرێژێک رایدەکێشا، بە تەنیشتما تێپەڕی. شتومەکی ماڵی لەسەر بوو، شێوەی لەماڵبارکردن دەچوو. دوو سێ بوخچە،

سنووقێکی دار، دوو تەنەکەی ڕۆنی بەتاڵ، تەشتێکی نایلۆن و قاپوقاچاغ و مەسینەیەکی سەوز، بە پەتێک، بە عارەبانەکەدا شۆڕببووەوە. لانکێک توند بە شریتێک بەسترابووەوە، پیرەژنێک لە ناوەند عارەبانەکە لە نێو پەڕۆپیتاڵ تەنها هەردوو چاوە کزەکانی دیار بوون؛ سەیری بەرامبەری خۆی دەکرد. پیرەمێردێکیش پەتی گوێدرێژەکەی بە دەستەوە بوو. وردە وردە دوور دەکەوتەوە. (ئەم میللەتە چل ساڵە خەریک بارە و هێشتا نەگەیشتۆتە مەنزڵ!) بە دەنگی فریشتەیەک دەچوو هەموو باڵەکانی هەڵقاچرابن.

ماڵی نەنکم بە دەستی ڕاست، کۆڵانی حەوتەم، بەرامبەر بە مزگەوتەکە، مزگەتەکەی مەلا عەبدوڵای ڕەحیمئاوا. کاتێک دەچوویتە کۆڵانەکە، ئیتر وردە وردە ئاستی کۆڵانەکە بەرزدەبووەوە و پاشان بە ئاستەم نزم دەبووەوە. ماڵی نەنکم و ماڵی قازی لە بەرزاییەکە بوو. بە کۆڵانەکەدا تێدەپەڕیم، هەموو دەرگاکان داخرابوون. پێش ئەوەی بگەیتە ماڵی نەنکم، کۆشکە دوو نهوومییەکەی قازی-مان لێوە دیار دەبێت. لە دوورەوەش تاقە خنجیلانەکە دەبینین کە جاران مایەی فێنکیی بوو.

گەیشتمە بەر دەرگا. یەک دوو جار لە دەرگام دا. کەمێک چاوەڕێم کرد. یەک دوو جاری دیکە لە دەرگام دا. کەس نەهات و کەس دەرگای لێ نەکردمەوە. لە پڕێکدا منداڵێک لەو بەرەوە دەهات و لێم نزیک بووەوە، بە بێ ئەوەی پرسیاری لێکەم، خۆی کەوتە قسە:

- دەمێکە ئەم ماڵەیان ڕاپێچی هەولێر کردووە!

- بەرەو هەولێر؟ منیش بە سەر سوڕمانەوە وەڵامم دایەوە.

پاڵێکم بە دەرگاکەوە نا، دەرگا بەرەوە ناوەوە کرایەوە. چوومە ژوورەوە، ئەویش بە دوامەوە. سەیرێکی دەستی ڕاستم کرد. " ئا لێرە، مانگا خۆشەویستەکەیان دەبەستەوە". بەرامبەریش دوو ژوورە لاکێشەییەکە بوو. تەنەکەیەکی بەتاڵ لە ناوەند حەوشەکە کەوتبوو. کاتی خۆی لە نێوان ماڵی نەنکم و ماڵی قازی دیوارێکی زۆر نزم هەبوو، پەنجا سانتیمەتر تێنەدەپەڕی. باخچەکەم بینی، دەمێک بوو ئاو نەدرابوو. گوڵ و پەلکەکانی لە شوێنی

خۆیان هیشک ببوونەوە، لاسکەکان بە قەدەکانیاندا شۆڕببوونەوە. پەڕەی زەرد و سوور و پەمەیی، کەوتبوونە سەر گڵەکە، هەموویان یەک ڕەنگیان وەرگرتبوو. قاوەییەک، ڕەنگی خاک. نمامەکەی جارانیش، درەختێکی زەبەلاح بوون، گەڵاکانی تێر و سەوز بوون، بەڵام توێژێ غوبار هەموو گەلاکانی داپۆشیبوو.

سەرم هەڵبڕی پابلقەکانم بینی. نزیک بوومەوە. پێم نایە سەر پەیژەی یەکەم و منداڵەکەش، بێدەنگ دوام کەوتبوو. سەرکەوتم. شوێنپێی خانەکان کوێر ببوونەوە و سەربان کەوتم.

ڕەحیمئاوا بە کۆن و نوێیەوە کپ و بێدەنگ. گەرمایەکی چڕ، گوێت ڕاگرتبایە، گوێت لە سرتەی گەرما دەبوو. لە دوورەوەش سەرابێکی تەنک، بەرجەستەکانی خستبووە لەرینەوە و لەسەر ئاوازی گەرما هەموو شتێک سەمای دەکرد، بەڵام بە سەمای مەرگ دەچوو. ئەم بێدەنگییە، سەرچاوەی سام بوو.

ئەم سامە پێویستی بە باسکردنە: جۆرە ترسێکە کاتی خۆی لە شەوانی غوربەتی تووشم دەبوو. بە تایبەت لە قۆناغی یەکەمی ئاوارەبوون. ئەم قۆناغە زۆر زاتییە، ناکرێت ببێتە پێوەر بۆ هەموو ئەوانەی ئاوارە دەبن. من باسی سەرەتاکانی هەشتا دەکەم، ئەوکاتەی ڕژێم لە ئەوجی هێزبوو. ڕاکردن لەو بارودۆخە ئاسان نەبوو و بە گیرسانەوەش لە شوێنێک کۆتایی نەدەهات.

ئەو سام و ترسە موزمینانە تێکەڵی کابووسەکانم دەبوون. نیوەی شەو لە پڕێکدا ڕادەچەڵەکام. دەیان چرکەی دەویست تاکو بزانم لە کوێم. مەبەستم لەو قۆناغەیە کە ژوورەکەم لە شەقامی کارۆلین بوو لە شاری ژنێڤ. پێنج شەش ساڵیک لەو ژوورە ژیام. هەر لەوێ شیعرەکانی " زەردک"م نووسی. نیوەی شەو لە پڕێکدا ڕادەپەڕیم و دەستم بۆ سویچی گڵۆپەکە دەبرد و هەڵدەستام پەرداغێک ئاو بخۆمەوە. نیوەی لەشم زیندانی کابووسەکە بوو و نیوەکەی تریش بە زەحمەتی لە گەڵم دەهات. بۆڕییەکەم دەکردەوە و ئاو

خورەی دەهات و پەرداغەکەم پڕ دەکرد و لەبەری دەڕۆیشت، ئینجا ئاوێکی ساردم دەخواردەوە و سەرم رادەوەشاند.

ئەم کابووسانە، یا ئەم خەونە ناخۆشانە لە مێردەزمەی دەسەڵاتی رژێم بەرجەستە دەبوون. سروشتی ئەو خەونانە بەمجۆرەیە: گەراویتەوە شارەکەی خۆت، یا لە پایتەختی، واتە لە نێو دڵەراوکێی ترس و راکەراکیت. بە بێ پسوولە، بێ شناسنامە و لە سەر هەمووشییەوە بێجامەت لە پێیە. وڵاتیش لە جەنگێکی خوێناوی دایە. تۆش بە پێی پەتی. ئیستیخبارات و ئەمن پێیان زانیوە کە گەڕاویتەوە. لە کۆڵانە تەسک و باریکەکان دوات کەوتوون. بێگومان شەوە. لە کۆڵانێک دەربازت دەبێت، تووشی کۆڵانێکی دی دەبیت. لەو کۆڵانەوە بەرامبەرت دێن. تووشی بازگە و سەیتەرەی ناوەخت دێیت و بە مەنتیقی خەون رزگارت دەبێت.

تووشی دڵە راوکێ دەبیت، کەوتوویتە نێو لابیرینتەوە، کۆڵانەکان تێکدەچڕژێنە نێو یەکترییەوە. هەر ئێستا دەتگرن. دەزانی ئەمە مانای چییە؟ هەلا هەلات دەکەن، تیلایان بە دەستەوەیە. تۆ خائینی عەهد و وەتەنی، تۆ دەستت لە گەڵ ئیمریالییەت و سەهیونییەت و رەجعییەکانی دەروبەر تێکەڵ کردووە. تۆ موخەریبی. تۆ لە گەڵ عەمامە لەسەرەکان پەیمانت بەستووە. تۆ دەستی شەیتانت ماچ کردووە. لە هەموو لایەکەوە شاڵاوت بۆ دەهێنن. دەنگی شاوور بەرز دەبێتەوە. لە پڕێکدا، لە سەربانەکانەوە پرۆژەکتەرت لێدەدەن، کۆڵانەکان دەکەنە نوێژی نیوەڕۆ.

تۆش بەپەلە، دەست بۆ گیرفانت دەبەی، بێجامەکەت بێ گیرفانە. لە پارچە کاغەزێک دەگەڕێی کە لەم زەڵکاوە رزگارت کات. هیچ نادۆزیتەوە. تەڵبەندەکان دەبینیت، لایتت لێدەدەن. هیچ. دەتەوێت هیز بدەیتە خۆت راکەیت، دەتەوێت باڵبگری، دەتەوێت نغرۆ بیتە ژێر زەوی، دەتەوێت بمریت و نەکەویتە دەستی ئەوان. چونکە خەیاڵیش رێگات نادات تاکو بزانیت ئەگەر بکەویتە دەستی ئەوان چت بەسەر دێت. (هەندەش نییە فلیمی مید نایت ئێکسپرێست بینووە) دەتەوێت را بکەیت، پێیەکانت وەکو چرێش عەردەکە بەر

نادەن، وەکو بنێشت رایدەکێشیت و لە پڕێکدا لە شەقامی کارۆلین، لە شاری ژنێڤ رادەپەڕیت و چەند چرکەیەکت دەوێت بۆ ئەوەی بزانیت لە کوێی. دڵت بەو ئاوارەبوونە هەند خۆش دەبێت و هەست دەکەیت بوویتەتە پاشای قەرەجەکان.

سەیری پانتۆڵە هەڵواسراوەکەت دەکەیت و بیر لە پارچە کاغەزە نووشتاوەکە دەکەیت کە ئیقامەی ساڵێکی تیا تۆمار کراوە. ئەمەش لە هەمان کات دا دڵخۆشییەکی لە رادەبەرت دەداتێ و لە هەمان کاتیشدا ئاوی کابووسەکانی داهاتووت دەدات.

کاتێک لەسەربانی ماڵی نەنکمەوە سەیری رەحیمئاوام دەکرد، سامێکی لەوجۆر موچڕکێکی خستە لەشمەوە. دەشمزانی ئەمجارەیان خەون و کابووس نییە، بەڵکو واقیع و راستییە. سەیری منداڵەکەم کرد کە لە تەنیشتم راوەستابوو و پێیم وت:

- ئەرێ دەڵێی رەحیمئاوا کەسی تیا نییە؟

- منداڵەکە سەیری ئاسۆی دەکرد و نوقمی ئەندێشە ببوو و پاشان سەیری منی کرد و پێی دەچوو نەمبینێ و پاشان سەیرێکی ئاسۆی سەرابی کردەوە و هەر دەتوت بە دەم خەونەوە قسە دەکات و وەڵامی دامەوە:

- تازە کار لە کار ترازاوە، خەلکی چیتر لێرە ئیدارە ناکەن، ئەو خەڵکەیان هەند فێری کۆچ و کۆچبارییی کردووە، کۆچ لە نیشتەجێبوون ئاسانترە.

- ئەی باشە ئێوە چی دەکەن؟

- ئێمەش رۆژێکمان لە پێشە... ئەویش وەختی دێت.

ئەو باسی رۆژێکی دی ئاسایی دەکرد. سەیریم کرد و لە خەت و سیمای رامام، منداڵیی خۆمم هاتەوە یاد.

- ئێوە بەرەو کوێ نیازی سەفەرکردنتان هەیە؟

- نیاز! بۆ بە نیازە کاکی خۆم! کەس نیازی نییە ئێرە بەجێبهێڵێت. نیاز وشەیەکە تەنها لە مەکتەب دەیخەینە رستەوە ئەگینا لێرە کەس بەکاری ناهێنێت. ئەم وشەیە مانای نییە.

هەستم بە زیرەکی ئەو منداڵە پێ پەتییە کرد.

- سنفی چەنی؟

- یەکی ناوەندی.

بەروە پابلقەکان گەڕامەوە. سەیری کۆشکەکەی مام قازیم کرد و بە هێواشیش دادەبەزیم؛ منداڵەکەش بە دوامەوەیە. حەزم دەکرد زیاتر قسەی لە گەڵ بکەم.

(باشە ئەو ڕۆژەی لە ئیبرایم خەلیلەوە ئاودیوی سنوور بووم. گەیشتمە زاخۆ و بۆ ئێوارەکەی سەرێکم لە کتێبخانەکاندا و لە هەر ڕۆژنامەیەک و دانەیەکم کڕی، بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواوم لە لا دروست بێت. هیچ لاپەڕەیەکی بۆ ئەم شارە تەرخان نەکرابوو کە خەریکی بارکردنە)

گەیشتمە بەر دەرگای حەوشەو بە منداڵەکەم وت:

- ئەی ماڵەوەتان چ دەڵێن؟

- ماڵەوە؟ مەبەستت باوکمە. چ لە دەستی باوکم دایە، باوکێکی بێدەسەڵات، هەر وەکو دەیان باوکی دیکە. ئەویش ئێواران، دوای ئیش، گوێ لە رادیۆ دەگرێت، دەنگی ئەمەریکا، لەندەن " هونا هەیئەتول ئیزاعەتول بەریتانییە". لاسایی رادیۆکەی دەکردەوە.

باوکم هەندێ منگە منگ دەکات و گوایە ئەمە هەڵوێست پیشان دەدات! هەڵوێست و ئەم کۆڵانە تەسکانەیان وتووە؟

- ئەی تۆ، بچکۆل؟

- تۆ بە راستە، کێ حیساب بۆ چڵمنێکی وەکو من دەکات. تۆ ئەڵێی خەڵکی ئەم وڵاتە نیت. دوای نانوچای خواردن، تێی دەتەقێنم بۆ دەرەوە. رۆژێک لە زێویەو رۆژێک لە ئیسکان و رۆژێکی دیش، چوزانم دەگەمە ئاخرحوسێن. ئەو شتانە دەنووسمەوە کە بەرچاوم دەکەون. هەمووی بە رەمز و ئیشارات دەنووسمەوە، ئەگینا حکوومەت و مناڵ و تواڵ جیا ناکاتەوە، بمگرن کەوڵەکەم دەبەنە دەباغخانە. لە گەڵ مناڵانی دی یاری دەکەم و هەندێجار ئێمەش باسی سیاسەت دەکەین.

به پێکەنینەوە.

- باشە، باسی سیاسەت بە ئێوەش دەکرێت؟

ئێمە کاتێک لە تەمەنی ئەو منداڵە بووین، هەرگیز وشەی سیاسەتیشمان بەر گوێ نەکەوتبوو.

بە دەم ڕێوە باسی ئەم شتانەمان دەکرد تا گەیشتینە سەر جادەکە.

پێی وتم:

- دەزانی ئێستا منداڵان زیاتر قسە دەکەن. ئەم بێدەنگییەت لە لا سەیر نییە؟ ئێمە باسی ئەمجۆرە شتانە دەکەین.

- خواحافیز بچکۆڵ.

یەک دوو هەنگاو لێم دوورکەوتەوە و گوێم لێبوو دەڵێت" بە قورعان تۆ خەڵکی ئێرە نیت".

لە جادەکە پەڕیمەوە و بە خێرایی بە پشت گەراجەکاندا بۆی دەرچووم. دەمویست قەدبڕ، بەرەو کۆشکلی بڕۆم و بیرم لە دوا رستەکەی منداڵەکەش دەکردەوە.

تاکو ئێستا هیچ شوێنێک حەوانەوەیەکی کاتیی پێ نەبەخشیوم، رەنگیشە تووشی نەخۆشی شوێن هاتبێتم؛ بۆیە زۆرجار وێنەیەکی ساکار هەندە سەرنجی راکێشاوم کە پێم خەوش و عەیبە بووە کە لای دۆستەکانم باسی کەم، نە بادە بە سادە و ساوێلکەم بزانن. بەڵام لاتانی ناشارمەوە، هەندێ شتێ زۆر ساکار سەرنج رادەکێشن و نازانم بۆ! هەندێجاریش شوێن بووەتە بارستایی و دوای ماوەیەک دەبوایە جانتاکانم بپێچمەوە سەفەر بکەم. رەنگە حەز بکەم لە نا-شوێن بژیم. تەنها لە پێناو ئەوەی خۆم لە دەستی ئەو بارستاییە رزگار کەم. بۆیە ئێستا تووشی گومان دێم و بە خۆم دەڵێم " ئەوە بە راستی منم بە پشت ئەم گەراجانەدا تێدەپەڕم؟ یا ئەوەتا ئەمە خەونێکە و بەس؟ خەونە لینجاکانی شەوانی مەنفایە و دەترنجێتە لەشی داهێزراوم؟ هەستم بە بارستایی خۆم نەدەکرد. نەمدەزانی هەم یا نا. هەم یا ئەوەتا هەندە نابات دێمەوە ئاگا و لە سەر قەرەوێلەکەی ژوورەکەی کارۆلینم.

پەردەکان لا دەدەم و پۆلیسخانەکەی بەرامبەر ماڵ دەبینم، ژنە سستەرەکە دەبین کە زۆربەی ئێواران کوڕێکی قۆزی دەهێنایەوە و ماڵ و پێکرا شەرابیان دەخواردەوە و گلۆپەکانیان دەکوژاندەوە و پەردەکانیان دادەدایەوە.

باشە دەبێ چ ساوێلکەییەک بێت، هەروا بە ئاسانی سواری قەمەریەک ببم و بە دەفتەر خدمەیەکی هەڵگەچراوەوە روو بکەمەوە شارە وێرانەکەم. هەر دەبوایە ئەم وێرانەیە بە چاوی خۆم ببینم؟

دەستم بۆ گیرفانی پانتۆڵەکەم درێژکرد و بە دوو پەنجە هەستم کرد کە دەفتەر خدمەکەم وا لە گیرفاندایە. دەرمهێنا و لێی دڵنیا بووم و خستمەوە گیرفانم. هەستم دەکرد کە لە نێو هەنگاوە هەراشەکانم ون دەبم. عەسرێکی گەرم و تەپوتۆزاویی بەلای مەغریبدا لار دەبێتەوە و شەو میهرەجانەکانی خۆی لە ناو پاشاگەدانیی، زیندوو دەکاتەوە. ئا لە کاتی وادا، زەمەن رەوڕەوەکانی خێراتر دەکات و شتەکان هەمووی بەرەو لێژاییەکان شۆڕ دەبنەوە. نەمدەزانی زەمەن بەرەو چ خەرەندێک پێچکە زلەکانی خۆی غل دەکردەوە. رەهەندەکان دەشێوان و هێڵەکان تێکدەشکانە نێو یەکتر. ئەم هێلانە فەزایان بریندار دەکرد و خوێنێکی ئاڵ بە قەبرغەی ئاسۆدا دادەچۆڕی.

چ سۆارغێکم چنگ کەوت؟ ئەمە وێنەی شیعرێک بوو لە بزەنسۆن نووسیم: شارەکەی رۆژهەڵاتی فەرەنسا.

وەڵامیش: هیچ. لە سەربانی ماڵی نەنکمەوە ئاسۆ نوقمی نێو سەراب، چونکە تەنها گەرمایی شتەکانی بەرجەستە دەکرد. تراوێلکەیەکی ئەبەدی دونیای خستبووە بریقەیەکی بێ کۆتاییەوە. بریقەیەک بوو کوێرایی لێ دەکەوتەوە.

ئەو دەرگایە، مەبەستم دەرگاکەی ماڵی نەنکمە، ئایا رۆژێک لە رۆژان نەبوو چەمکی چاوەڕوانی؟ ئایا ئەو دەرگا رەقوتەقە بەرجەستەی چاوەروانیی نەدەکرد؟ ئایا ئەم رستەیە بە ئاسانی خۆی دەداتە دەستەوە.

بەڵام بەم تەرحە دەکرێت باسی لێوە بکرێت: ئەو دەمەی مام قازی لەبەر هەیوانی کۆشکەکەی ئەسکەمبیلێکی دادەنا و بەرامبەر بە خۆرکەوتن دادەنیشت، ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات کە ئەو دونیایەی کە ئەو تیای دەژێت گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی تیا روو دەدات. دونیایەک وەکو ئەختەبووت، شتەکان دەکاتە تەونێک و مەسافەکان کورت دەکاتەوە و ماوەی نێوان حەسار مەحەتە و قادرزەمە بە تەواوی دەسڕێتەوە. بەڵام بە چاوێکی باوکانە و پڕ حیکمەتەوە تەماشای هەراشبوونی هەر چوار کوڕەکەی دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، نە لە توانای ئەودا بوو، نە لە توانای کەسێکی دیکەدا هەبوو کە رێ لەو باهۆزە بگرێت کە ئێوارنێک کوڕە گەورەکەیان دەفڕێنێ. دەمێک بوو ئەو باهۆزە لە پایتەختەوە هەڵیکردبوو و رۆژێ لە رۆژان بە کۆڵانەکانی رەحیمئاوادا تێدەپەڕی و بیست گەڵای تەمەنی گەورەکەیان بەرەو نادیارییەکی هەتا هەتا رادەپێچێت.

ئەم رووداوە لە کاتێکدا روو دەدات، کە تەنها هەر دوو ساڵ بەسەر بەیانی یانزەی ئازاردا تێپەڕی بوو. باهۆزێک بوو لە ناو جەرگەی پایزانەوە سەریهەڵدابوو و دەیویست رەگوڕیشەی درەختەکانیش لەبنەوە بۆ یەکجارەکی هەڵتەکێنێت. ئەم کارەساتە جەرگبڕە، نە بەسەرەتا دەبێت حسێبی بۆ بکرێت نە بە کۆتایی، بەڵکو تەنها وێرگوڵێک بوو لە سەر لاپەڕە لە بنەهاتووەکانی تراژیدیایەکی بێ ناونیشان مردارەوە بوو. یا بووە گرێکوێرەیەک و لە دامێنی مێژووی ئەو خێزانە درا. ئەمە نۆبەرەکەیان بوو کە گەورە نەبوو، یا زۆر زوو گەورە بوو بۆ ئەوەی بەر ئەو رشانەوە رەشە بکەوێت. لێرەوە بۆچوونەکانی خوێن و قوربانی، ئازادی و ئاشتی وەکو سپیاڵە پیرۆزەییەکانی سەر گۆڕە بێناوەکان، بە بێهوودە دەشەکانەوە.

نوبەرەکەیان زوو یاخی بوو. بەرووبوومی ئەو یاخیبوونانەش بە بێوچان تاقمێک، وەکو ئیسفەنجی وشک هەڵیدەمژێ و لووشی دەدا و لە ناوەڕۆکی خۆی دایدەماڵێ و لە هەموو واتایەکی پۆزەتیڤیش بەتاڵی دەکات. ئەنارشی بوو، بە بێ ئەوەی کتێبەکانی پرودۆن بخوێنێتەوە. لە نێوە رێگاکانی

یاخیبوونەکەی کامۆ ساتمەی کرد، بەردی فڕێ دەدایە هەموو گۆمێکەوە بۆ ئەوە تووشی شلەقانی کات، دەیویست لە وەستان و بۆگەنبوون قوتاری کات. ڕێی لە شەو دەگرت و دەیویست قەدەری خۆی بنووسێتەوە. زۆر زوو گەورە بوو، یا وردتر ئەو باردۆخە زوو پیری کرد و خۆی تەسلیمی ڕێگا نادیارەکان کرد. ڕۆژێکیان لە خەو هەڵدەستێت و تفێک ڕۆ دەکات هەژاریی و کوێرەوەریی و باوکێک زووماڵئاوایی کردبوو، دڵی هەڵدەشێوێنێت. ئەو سەرلەبەیانییە هەستی کرد باری قورسە و ئاووهەوای ڕەحیمئاواش ناهەموارە بۆ ژیان. تفێکی هەڵدا و ڕۆیی. کەس نەیزانی بۆ کوێ ڕۆیی.

دایکی هێشتا جلە ڕەشەکەی مێردەکەی فڕێ نەدابوو، هەواڵی ونبوونی ئەوەیان پێ ڕاگەیاند، ونبوونێک بوو ڕەش دەچووەوە. بۆیە نەیدەزانێ لە جلە ڕەشەکەی زیاتر چ جلوبەرگێکی ڕەشتر بۆ پرسەکانی بدۆزێتەوە، بۆیە گوڵێکی سووری لە تیلی چەرخەتەکەی گیر دەکرد و لەبەر دەرگا تا شەو بە تەواوی ڕادەشکا، ئەو چاوەڕوان بوو. هەموو ڕۆژێ و لە دڵی خۆیدا دەیوت ئیمرۆ نا بەڵام بێگومان سبەینێ دێتەوە.

هەموو دەمەوئێوارنێک لە غەیبەوە دەیانچرپاندە بناگوێی و پێیان دەوت ئیمرۆ کوڕەکەی ڕەنگە بێتەوە. ئەمە تەلیسمی ئەو جەستە مردووانەیە کە ناکەونەوە دەست خاوەنەکانیان. ئەگەر مردوو بەچاو نەبینرێت، دڵ ئاو ناخواتەوە. ئەمەس یەکێکە لە نهێنییە قووڵەکانی مەرگ. ئیتر چاوەڕوانی حەکایەتەکانی خۆی دەئافرێنێت. دەیان چیرۆکی فەنتازی و سەیروسەمەرە لە دایک دەبن وهەموو بە مەنتیقی خۆی، دەبێتە جێی باوەڕ. کێ بوون خاوەنی ئەم چیرۆکانە؟ ئەو کات کەس بیری لەم پرسیارە نەکردبووەوە. حەکایەتەکان لە دوورەوە دەهاتن و کاتێک دەگەیشتنە بەردەمی ئەو، حازر و ئامادە بوون. نەدەبوو بکەونە ژێر پرسیار و گومانکردنەوەوە چونکە هیوایان پێ بوو. هیوا واتە کوڕەکەمان چی لێهات؟ وەکو پێداویستی وابوون، دەبوو

یەکێک لە مەجهوولەوە دروستیان بکات. بەرهەمی سەفەر دووررودرێژەکانی خەیاڵ بوون.

یەکێک لە ئەکتەرە هەڵخەڵەتاوەکانی ئەم ئۆدیسیێیە، کابرایەک بوو ناوی قالە تەگەرانی بوو. ویستی دەیان بەڵکو سەدانی وەکو نۆبەرە، لە مێرمنداڵ و هەراشی ئەو دەورەبەرە کۆبکاتەوە و بەیەکەوە بە کارەساتە هەر سەرسورێنەرەکانی ساڵانی حەفتا هەڵسن. وەکو دەریاوانێکی زۆرزان، بەڵام ناشارەزا، لە ڕێی دەریای عومانەوە بگەنە وشکاییەکانی ئێران و موغامەرەکانیان لەو دیو سنوور باس کرێن. ڕاستە، ئەمە ڕووی دا، بەڵام چۆن ڕووی داو وردەکارییەکان چۆن بوون. زەربە بوو لە ئێران، لە پێناو چی؟ پرسیاری زۆری بێ وەڵام ماوەتەوە...

هیچ حەکایەتێک، هیچ چیرۆکێک، هیچ گێڕانەوەیەک بە تەواوی فێنکییەکی تەواوی نەدەبەخشییە نەنکم، بۆیە دەمەو ئێواران، دایک و دەرگا دەبوونە یەک شت. لەبەر دەرگاکە ڕادەوەستا و دەیڕوانی، دەیڕوانی و چاوەڕێی دەکرد تا دونیا بە تەواوی تاریک دادەهات ئیتر هیچ شتێک لە هیچ شتێک جودا نەدەکرایەوە، ئەویش دەرگاکەی لە دووی خۆی دادەخست و دەچووە ژوورەوە تا ڕۆژی ئایندە. ئێوارەکان لە سەر یەک کەڵەکەیان دەبەست و شەویان دەهێنا. وردە وردە لە لۆچەکانی ئەم هەموو چاوەڕوانییانەوە عەبا رەشەکەی مەرگ دەردەکەوتن. شەپۆلە چاوقایمەکانی ڕۆژگاریش شتەکانی دەسواند و مەرگیش وەکو زەرووڕەتێک دەبوایە هیوا بهێنێتە سەر چۆک. بەڵام لە ناواخنی شتەکاندا، زاکیرە مافەکانی خۆی دەسگیر دەبوو و چیرۆکەکان هەر هەموویان لە کۆتاییدا یەک شکلیان وەردەگرت و بە زیندووی تا ماوەیەک مانەوە. ڕازیبوونی بێدەسەڵاتانە دەسەڵاتی خۆی دەسگیر بوو... یەکێک لە بیچمەکانی بێهوودەیی لە ژیانی ئێمەمانان!

بێهوودەیی ئەنجامی بیرکردنەوە و ڕامانی فەلسەفی نەبوو، بەڵکو وەکو پەقرەنجە ئاوێکی ساردبوو لە ساتەوختێکدا دەیڕژێننە سەروچاوت.

بێهوودەیی بوو نەزانم لە کوێم. ئەوەندە دەزانم ئێوارەیەکی خامۆش خەریک بوو شاری دەپێچییەوە نێو هەگبە تاریک و دڵساردەکەی خۆی. لە پێڕستی ئەم بێدەنگییەی ئیمرۆشدا، روخسار و دەنگی منداڵە پێ پەتییەکەی بەر دەرگای ماڵی نەنکم، چەند تەلیسمێکی رژاندە ئەو هەگبە ساردوسرەوە؛ نەمدەتوانی وا بە ئاسانیی نە وەسفی بکەم و نە رەهەندەکانیشی دیاریی بکەم. دەبێت رۆحی یاخیبووی نۆبەرەکە نەبووبێت و گەڕابێتەوە؟ ئەی بۆ هەندە بە زیرەکی و بە وردی قسەی لەگەڵ دەکردم؟ ئەی نەدەبوو زیاتر قسەم لە گەڵی بکردبایە و بمزانیبایە کێیە؟ بە دەم ئەم وردە لێکدانەوانەدابووم، شەو بە تەواوی راشکابوو و بێدەنگییەکی قورس و رەزاگران سواری ئەستۆی شار ببوو. ماندووبوونەکەی منیش هەندەی دیکە ئەتمۆسفێر و جەوەکەی قورستر کردبوو. کەمێک هەستم بە تینووبوون کرد و تک تکیش عارەقی کۆبووەوە ژێر گەنگڵم بە رچەیەکی ساردا، بە قەبرغەمدا، دەهاتە خوارەوە. گڵۆپەکانی دارتەلەکان بە ناڕێکی داگیرسابوون، دەتوت تەپوتۆز لە دەوری گڵۆپەکان دایە و تیشکێکی لێخنی بڵاودەکردەوە. دەرگا و دیوارەکانی بە ئاستەم رۆشن دەکردەوە. تاریکیی بە ناڕێکی لە سەر بەرجەستەکان یخ لێی کەوتبوون.

هەنگاوم دەنا و نەمدەزانی بۆ کوێ دەچم. بە قەناعەتێکی کەمەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ماڵی خۆمان بەزەحمەت دەدۆزمەوە. دوای هەنگاوەکانم کەوتبووم و ئەو سەرداریی لەشی دەکردم و وەکو یەخسیر لە دوای خۆی رایدەکێشا. زۆربەی زۆری دەرگاوپەنجەرکان داخرابوون. زۆر بە دەگمەن چرایەک لە ژووری داگیرسابوو. بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتم حەزم دەکرد بگەمە شوێنێک هەندە نەفرەتی لەدواوە نەبێت. بە ناولەپیش، بێوچان عارەقەی سەر نێوچەوانم دەسڕییەوە و گوێم لە زریکەی ئیسعاف دەبوو، لە دوورەوە دەکەوتنە بەرگوێم و بە باریکیش دەرژانە کۆڵانەکاوە. سەگڕەو لە لایەک و شاووری حەسحەسانیش لە لایەکی دی. لە چەقی رێگا بووم نەدەکرا بگەڕێمەوە و نە ئامانجی رەوتەکەشم بە ئاسانی بۆ روون

دەبووەوە. کراسە سپییەکەم بە تەواوی تەڕ ببوو. هەندێجار کزەبایەک پێستی روخساری دەماڵیم. دوو ناڵچەکەی ژێر پێڵاوە چەرمەکەمیش، دەنگێکی لەسەر شۆستەکان دروست دەکرد، بە تایبەت کاتێک وردە زیخێک دەکەوتە نێوان ئەو پارچە ئاسنە و چەمەنتۆیەکە. سەرەرای ئەوەی ئەم خرمانە بێدەنگییەکەی دەشێواند، بەڵام دەنگیکی ناخۆشتری دروست دەکرد. بێدەنگییەکان وەکو بۆشایی وابوون بە شاووری حەسحەسەکان پڕ دەبوونەوە. هەستم دەکرد ئەمە بانگەوازێکە بۆ ئەوەی شەیتانەکان دەروازەکانی جەهەننەمم بۆ بکەنەوە.

پێی دەچوو ئەمە پێشەکی سەمفۆنیایەک بێت، هێشتا نەنووسرابێتەوە. سەرەتا زۆر نەشاز و ناجۆر خۆی دەناساند، دەنگە بەرز و نزمەکان، لە سەر ئیقاعە جیاوازەکان دەڕژانە نێو یەکتریەوە، پاشان وردە وردە شکلیان وەردەگرت. لە هەمووشی سەیرتر هەستت دەکرد دەنگەکان نزیک دەبوونەوە. جارناجارێک، لەسەر بانەکانەوە، پرۆژەکتەرەکان لار دەبوونەوە و کۆلانەکانیان بە رووناکییەکی تۆقینەر ئاوەرشێن دەکرد و زریکەی و فیزاحی ئۆتۆمبێلەکانیش وەڵامی شاوور و قیژەیەکیان دەدایەوە کە لە نادیارەوە دەهات. گلۆپە سوور وشینەکانی ئیسعافەکانیش لە گەڵ خرمەی پێڵاوەکانم، ریتمی کابووسییان دروست دەکرد. نازانم لە کوێیەوە دەنگی دەهۆڵێک دەهات و عالەمی جەنازەیی دەبووژانەوە. ئیسقانی مردووەکان بوون لە قەبرەکانیان هەڵسابوونەوە و سەمایان دەکرد. سەمای مەکابر هەر وەکو فەرەنسیان دەڵێن، لە ئاخر و ئۆخری زەمانەوە هەڵدەستایەوە و وەکو ئەوەی من سەنتەرێک بم و ئاوازەکانیش بەرەو من بێن؟

جیبێکی سەربازیی بە تەنیشتما گڤڤەی هات، دوای ئەوە ماتۆڕیک فڕەی هات و تەپۆتۆزێکی زۆریش لەبەر رۆشنایی پرۆژەکەتەرەکان کۆبوونەوە. دەستێکم بۆ گیرفانم بردەوە و لە سۆراغی دەفتەر خدمەکەم بووم. توو بڵێی ئەوراقەکانم مەزبووت نەبن!

گوێم لێبوو لە کۆڵانەکەی ئەودیو، دەنگی ژاوەژاو و غەڵبەغەڵب دەهات. گژژەی ئۆتۆمبێل و دەنگی پۆستاڵ و رستەی کورت دەکەوتنە بەر لایتەکان. قیژەی پیرەژنێک، فیزاحی کچێک، هەستم دەکرد ئەوە یەکێک بۆ گۆڕەپانی جەنگەکان ڕاپێچ دەکەن. هەستم کرد، دوای ئەو نۆرەی من دێت. جەنگ گەورە و کچکە ناناسێت، کە زەنگی جەنگەکانی لێدەدرێ، ئیتر تەڕ و هیشک پێکەوە دەسووتێنرێت. سەیری دەرگاکانم کرد هەر هەموو داخرابوون. پێم هەڵگرت و کەوتمە گورگەلۆقە. نەمدەزانی چۆن خۆم لەو کەتنە بپارێزم کە خۆم لە خۆمم کردبوو. گەیشتمە سەر سووچێ، ئەگەر دەستی راستم وەرگرتبایە، ئەوە لە کۆڵانەکەی ئەودیو، ئەوەی دەنگە و هەرای لێوە دەهات، زیاتر دوور دەکەوتمەوە. کەوتمە غاردان، تەنها سەد مەترێک دوور کەوتبوومەوە و جێبێک بەرامبەرم زۆر بە تیژیی دەهات و یەکێکی لە پشتمەوە زۆر بە تیژیی دەهات و لە تەنیشتم ستۆپێکی گرت و راوەستا. بە گورجی چەند جەندرمەیەک لێی دابەزین و لێم نزیکبوونەوە:

- وێن رایح؟ هەویتەک؟

منیش لەوە دڵنیا بووم کە دەفتەرخدمەکەم لە گیرفانە، خێرا دەستم بۆ گیرفانم برد و پسوولەکەم دایێ. ئەویش لایتەکەی لە بەر نیتاقەکەی کردەوە و سەرەتا ئاراستەی وێنەی سەر دەفتەرەکەی کرد و پاشان لایتەکەی ئاراستەی من کرد. وەخت بوو کوێر بم.

- وێن رایح، هیچی مەخبووس؟

- لا وەللا، ماکو شی راجع للبیت.

- ها، راجع للبێت، وێن بێتکوم؟

من خۆم ئەم پرسیارەم لە خۆم دەکرد، ئێستا یەکێکی دیش هەمان پرسیارم لێدەکات!

- بیسەراحە جای زیارە. چەم یۆم و ئەرجەع.

ویستم بەم وەڵامە خاڵێک بۆ ئەم پرسیار و وەڵامە ئیزعاجانە دانێم. بەڵام پێی دەچوو ئەمە گومانی لە لا دروست کردبێت و "جای زیارە ها!" بە

لاساییەوە ئەم رستەیەی بە تەوسەوە دووبارە کردەوە. وەکو ئەوەی پێم بڵێ مەبەستی دیکەم لەم سەفەرە هەیە.

سەیرێکی جەندرمەکەی دیکەی کرد و دەستێکی بۆ مەچەکم راکێشا. منیش خۆم راپسکاند و لە ژێر دەستییانەوە وەکو کەروێشکێکی کێوی بۆی دەرچووم. هێزێکی بە تینم دایە خۆ و پەنجەرە و دەرگاکان لە پێش چاوم رایان دەکرد. غارم دەدا و ئەوانیش لێم دووردەکەوتنەوە. خۆم کر بە کۆڵانێکی تەسکدا، تەنها لە سەر سووچەکەی ئەوبەر تەنها گڵۆپێک داگیرسابوو، زۆر کزبوو، بە ئاستەم سووچی کۆڵانەیەکی رووناک کردبووەوە. لە پڕێکدا، لایت بە دەستێ بەرامبەرم بە راکردنەوە دەهات. خۆم وەرچەرخاند و کووچەیەکی تەسک هەبوو و شۆڕ دەبووەوە و تریفەی مانگ قەراغ سیانەکانی کەمێک رۆشنکردبووەوە بۆنی ئاوی رەش دەهات. منیش بە ناوەند سیانەکەدا غارم دەدا، قورگم هیشکبوو و عارەقەیەکی زۆریشم کردبوو. لە پڕێکدا، هەستم کرد سیانەکە رێڕەوەکەی لێژتر دەبوو و تا قوولەقاپیشم کەوتە ناو سیانەکە، قوڕ و چڵپاوێکی گەرم بوو و هێزی زیاترم دەدایە خۆم. ئەوانیش بە لایتەوە، بە دوامەوە بوون. فیقەیان لێدەدا. گوێم لە یەکێکیان بوو "ئلزمە ولەک، های منهم".

هەستم دەکرد تەڕاییەکەی کە هەردوو پێیەکانی نوقم کردبوو، تا دەهات قووڵتر و بەرینتر دەبوو. سیانێکی لینج و خلیسکاویی و کەمۆکەیەکیش گەرم. هەردوو پێڵاوەکەم پڕ لە سیاناوی لینج بوون و کێشی راکردنەکەی سەنگین دەکردم. بەڵام هیچ چارەسەرێکم نەبوو، دەبوایە هەر چ چۆنێک بێت خۆمم لێیان قوتار بکردبایە. هەردوو پاژەنەم بەرە پیشەوە خلیسکان و بەسەر قنگا کەوتم و بەرەو لێژاییەکان شۆڕ بوومەوە. بە سۆلاڤێکی چڵکاو دەچوو و گوێم لە دەنگی یەکێکیان بوو "ئنفلەت هاذالکەلب". هەستم دەکرد ئەملاوئەولام دارودەوەنە، پووش و پەڵاشی تەڕ بوون، هەر دوو بازووەکانم وەکو سەوڵ کردبووە و بە پەنجە دەوەنەکانم دەگرت بۆ ئەوەی بزانم بەرەو کوێ شۆڕ دەبمەوە. ئەفسووس! نەمدەزانی ئەم چڵکاوە بەرەو کوێ دەمبات.

فڕێم دەداتە چڵکاوەکانی خاسەوە؟ ڕوەک و دەوەنەکان هەندێکیان لە ڕەگوڕیشەوە لە گەڵ دەستم دەهاتن و قەدە زبرەکانیان ناولەپیان بریندار دەکردم. بۆنی چڵکاو و بۆنی سابوونی گەنیو دەهاتە بەر لووتم؛ وەخت بوو بڕشێمەوە. ئەمجارەیان کەوتمە سەر سک و چەناگەم وەکو گاسن ناوەندی سیان و چڵکاوەکەی شەق دەکرد. نازانم چ کەندڕێک بوو، بە تەواوی وەکو ئاژەڵێکی ئەفسانەیی قووتی دام.

لە کوێ چاوم کردەوە؟

دۆشەکەکەم نوقمی عارەقێکی لینجی بۆن ناخۆش بوو. بە بێ تاقەتی و کزییەوە قەرەوێڵەکەم جێهێشت و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم. پەردەکەم لادا، خۆر دەمێک بوو هەڵاتبوو. دەرەوە گەرم ببوو. بیری دوێنێم کرد و خەیاڵی منداڵەکەی ڕەحیمئاوام کرد کە چۆن هەر بە غاردان خەریکە لە ڕەحیمئاواوا بەرە زیویە دەڕوات. لەو بەرەوەش سێ و چوار منداڵی هاوتەمەنی خۆی چاوەڕوانی دەکەن، هەموویان دەستیان کردۆتە کەپری تەوێڵیان و سەیری ئەوبەر دەکەن. دەیان بینی منداڵێک خەریکە لە ناوتەپوتۆزەوە بەرەو لای ئەوان دێت. دەتوت ڕۆحی نۆبەرەکەیە لە ناو سەرابدا غار دەدات.

پەردەکەم دادیەوە و بازووەکانم وەکو سەوڵ کردەوە و باوێشکێکی تەواوم دا. هەرچەند من بەیانیان زۆر کەم حەز بە جگەرە کێشان دەکەم، بەڵام ئەو بەیانییە دەستم بۆ پاکەتەکەم درێژکرد و جگەرەیەکم دەرهێنا و دامگیرساند. یەک دوو شتی دوێنێ بە تەواوی داگیریان کردبووم. یەکێک لەو شتانە ئەوە بوو: نازانم چۆن گەڕامەوە.

تیشکێکی زۆری دەرەوە بۆ ژوورەکەم هەڵمەت دێنێ و بۆنی نانی گەرمیش دێت و بۆنی ئاردی سووتاویش لووتی دەتۆزاندمەوە. پەنجەرەکەم کردەوە. نیوەی جگەرەکەم مابوو، بە پەلا(لە)پیتکەیەک لە پەنجەرەکەوە فڕێم دایە دەرەوە. دوو شەپ ئاو، دەموچاوم فێنک کردەوە و پانتۆڵەکەم هەڵکێشا و چوومەوە دەرەوە و ماڵی ئێمە دەبێت لە کوێ بێت. بەم پرسیارەوە چوومەوە دەرەوە.

# خەیاڵی ئەشکەوتێک

هەر ئەو رۆژەم مابوو لە کەرکووک و دەبوایە سەر لە شوێنێک بدەم کە ناوی نییە. لە قەراغ خاسە چەند ماڵێک دروستکرابوون و خەڵکەکەی خۆیان بە زەرعاتەوە خەریک کردبوو. راستە خاسە رەحیمئاوای لە زێویە جودا دەکردەوە، بەڵام باجی گورجی، کچە گەورەکەی مام قازی، ئەم دوو گەڕەکە بە ناوبانگەی کەرکووی پێکەوە گرێ دەدا.

دەمێک بوو شووی بە مامە حەمە کردبوو و دوو کوڕ و دوو کچیان هەبوو. کاتی خۆی لەوبەر، لە زێویە دەژیان، بەڵام لە حەفتاکانەوە هاتنە ئەمبەر و لەسەر رۆخی خاسە، کەپرەکەی جارانیان روخاندا و لە جیاتی ئەوە خانوویەکیان دروستکرد. دوای ئەو خانووە، چەند خانوویەکی دیش دروستکران، وردە وردە شیکلی گەڕەکی وەرگرت. بەڵام گەرەکێکی بێ ناو.

باجی گورجی ژنەموختاری ئەو چەند ماڵە بوو، ژنێکی چاپووک و بزێو و دەمهەراش. پێیەکی لە زێویە بوو و پێیەکەی تریشی لە رەحیمئاوا. ئەو لەو ژنانە بوو کە بە تەواوی شەخسیەتی مێردەکانیان دەسڕنەوە، بۆیە مناڵەکانیش هەر بە ناوی ئەوەوە بانگ دەکرێن. کاتێک لە مەجلیسی پیاوانیش دابنیشتایە، جگەرە قامیشەکەی دەردەکرد و چاوی دەبڕییەوە ناو چاوی پیاوانەوە و قسەی لە گەڵ دەکردن. ئەگەر شتێکی بە دڵ نەبوایە، ئەوە جوێنێکی مزری هەڵدەبژارد و هەمووانی دەکردە پێکەنینەوە. کەس لێی توڕە نەدەبوو.

مێردەکەشی، واتە مامە حەمە، بەو رۆژگارە لە ناو زەرعاتەکەی خەریکی جەوە دروستکردن بوو و شتڵە تەماتەکانی بە پەتەکانەوە هەڵدەواسی و ئاوی تەڕەپیازەکانی دەدا و ناو لەپەکانیشی وەکو رووەمەتی بامیە زبر بوون. لە دوورەوەش لە ناو زەرعاتەکە هەر بە داوەڵی دەکرد. چاکەتێکی بۆری دوو بەرگ و شەرواڵێکی رەنگ تێر و دوو سێ کراسیشی لە سەر فانیلەیەکەوە دەکردە بەر کە کەس نەیدەزانی رەنگە ئەسڵییەکەی چی بووە. رەنگ و لۆچەکانی بە جۆرێک

تێکەڵی یەکتر ببوون و بەشێک بوون لە سیما و تەبع و کارەکەتەری مامە حەمە. پیاوێکی بێ وەی، وەکو خوداوەندی زەرعات و روەکی یەزدانی.

ژیانێکی سادە هەر وەکو شەتڵە باینجانەکانی. ئێوارانی دەرنگ، دوای رۆژگارێکی جوتیارانە دەگەڕایەوە ماڵ؛ دوای ئەوەی شلەساوەرێکی خەستی بە تەرەپیازەوە دەخوارد و سێ و چوار چای پۆلیسی: واتە شیرین و سەنگین، ئینجا جگەرەیەکی شاوری لە پاکەتە قاوەییەکەی دەردەهێنا و بەرامبەر بە چرا کزەکە، لچەکانی شۆڕ دەبوونەوە خەوێکی کەستەکی، وەکو میری داستانەکان ئامێزی بۆ دەگرتەوە.

ئەوان تەنها ئەڵقەی نێوان رەحیمئاواو زێویە نەبوون، بەڵکو ئەڵقەیەک بوون کە هەموو خێزانەکانیان پێکەوە گرێ دەدا. بەهاران هەر بە کەیف، سەرمان لە کۆشکەکەی قەراغ خاسە دەدا و دەیان تەرحە گوڵ و گیاوگۆڵی بەهاران ئەو قەراغانەیان شین دەکردەوە. بۆ من ئەوان، ئەو سەرلەبەیانییە بوونە تاقە هیوا، بۆ ئەوەی بزانم سۆراغی ماڵەکان چی بەسەر هات. ماڵی ئێمە لە کوێیەوە و ماڵی نەنکم لە کوێیەوە چی بەسەر هەتا گشت حەکایەت و بەسەرهاتەکان؟ ئەوان ئێستا هەر نەبێت، چمکی هەوڵێکیان لە لایە، دەبێ بڕۆم و بزانم چیم دەست دەکەوێت.

ئەو خانووانە لە پشت کارگەی کۆکا کۆلان، لەوێوە خۆم دەکەم کۆڵانەکانا و رێک و راست ئیتر ئەو چەند ماڵەم لە بەردەم قووت دەبنەوە کە ناویان نییە. بە تەنیشت کارخانەی چەگلەکانا تێدەپەڕم کە خەباتە زل و لۆری زەبەلاح گردۆکەی چەگل و زیخیان دروست کردووە، چونکە کارگەی کاشییەکە لەو ناوەیە. ئەم ئاسنە زەبەلاحانە، شێوەیەکی هاوچەرخیان نەبەخشیوەتە ئەو ناوە، بەڵکو قەراغ خاسەیان شێواندووە و برینداریان کردووە. ئیتر لەوێوە شۆڕ دەبمەوە و تووشی چاڵی گەورە دەبم کە بەهاران پڕ ئاو دەبن و منداڵانی ئەو ناوە، لە ناو ئەو ئاوە پیسە مەلە دەکەن و هەموو بەهارێکیش یەک دوو منداڵی تیا دەخنکێت.

ماڵەکەی ئەوان لە خڕی خاسە جودا نەدەکرایەوە. خۆ ئەگەر زستانی تووشیش، تووشیان بوایە، ئەوە هەندێجار ئاو تا بەردەرگایان دەهات، سەرەرای

ئەوەی بیریان لەم گیچەڵە کردبووە، بەڵام سروشت ناوبەناو تۆڵەی نەویستی خۆی دەکردەوە. پێش ئەوەی تەمەڵی ئەم خانووە لێدەن، بیریان لە ئاو و باران و لافاوی بەهاران کردبووەوە، بۆیە یەک دوو گەز تەمەڵەکەیان بە تلیشە بەرد بەرز کردبووەوە، ئینجا یەکە خشتی قوڕیان دانا. دوو پەنجەرەی گەورەش، یەکێکیان بەرەو رۆژهەڵات، ئەگەر لە ژووریش دابنیشتبایتایە، شینایی زەرعات و داوەڵەکەت دەبینی، کە پایزان ریشۆڵە بە دەوریا فڕەفڕیان دەکرد. دیمەنی کەرنەڤالی هەبوو. پەنجەرەکەی تریش، روەو باکوور، لە دەرەوە، بستێک زیاتر گەچڕێژکرابوو و تەختەی پەنجەرەکەش بە شینێکی کاڵ بۆیاغ کرابوو. لە ژوورەوە کاتێک ئاسمانی سامالّی بەهاران، بە هەوری تەنکی شاش بڵاودەبووەوە و لە پەنجەرەکەوە بە تابلۆکانی مارگریت-ی دەکرد. فێنکییەک دەروونی داگیر دەکرد. ئەو فێنکییەی لە هەڵەتەکانەوە دەهات، بۆنی گژوگیای خۆڕسکی بەهارانی رادەمالّی و پێش ئەوەی تێکەڵی زبڵ وخۆڵ وخاشاکی ئەو ئاقارە بێت، بە پێش مالّی ئەواندا تێدەپەڕی.

نازانم کەی مامە حەمە باجی گورجی خواستبوو و چۆن ئەم پەیوەندییە دروست ببوو؟ ئەوی خەڵکی زێوە و مام قازیش خەڵکی قادرزەمە! بەڵام پێی دەچوو پەیوەندییەکی زۆر بەتین لە نێوان کۆشکەکەی مام قازی و مام حەمەدا هەبوو. مالّی خەزوور، بەڵام لە خەزووریش زۆر زیاتر بوو. هەر کاتێک مام قازی پێویستی بەوە بوایە چاوی بە گورجی بکەوێت، ئەوە دەچووە سەربان هەر لە سەربانەوە و بە دەنگێکی ساف و بێگرێ بانگی دەکرد و بە دووربینەکەشی سەیری دەکرد. باجی گورجیش، ئەگەر ئیشی هەبوایە، ئەوە پەڕۆیەکی سووری رادەوەشاند، ئەگەریش بێ ئیش بوایە، ئەوە زەرعاتی بەجێدەهێشت و هەندەی نەدەبرد، بە کۆشێ تۆڵەکە و تەڕەپیاز و یەک دوو سەلکە توورەوە، دەگەیشتە پێش کۆشکەکەی مام قازی. ئەگەریش پەڕۆیەکی سپی رابوەشاندایە، ئەوە مانای ئەوەی بوو کە ئێوارە بە هەمان کۆشی تەڕەوە دەگاتە لایان. ئەمە زمانی کۆمۆنیکاسیۆنی نێوان رەحیمئاوا و خڕەکە بوو.

تەنها ژن نەبوو کە جەرگی سووتاو بێت! نۆبەرەکەی ئەویش بووە قوربانی شۆڕشی ئەیلوول، بۆیە کراس و کەواکەی لە خمخانە هەڵکێشابوو. سەرەرای گشت ئەو ئازار و زوخاوانەی کە رشتبووی، سەرەرای گشت ئەو سوێبوونەوانەی کە دڵی لە هەردوو لاوە بە تەواوی داغ کردبوو، بەڵام دڵیشی بەوە خۆش بوو کە بە رەنجی شانی خۆی لەم ئاقارەی کە پێشتر ماڵێکی لێ نەبوو، تەمەڵ لێدا و خانوویەکی قنجیلانە دروست بکات. نەک تەنها ئەمەو بەس، بەڵکو دەمێکی دی، ژن بۆ کوڕە ناوەنجییەکەی دەگوێزێتەوە و بۆ کوڕەکەشی ساڵیادی شەهیدبوونەکەی بەسەر دەکاتەوە. لە شەست و سێیەوە تا ئەو ساڵە، هەموو ساڵێک لە ئانووادەی خۆیدا، مەولوودێکی ساز دەکرد. مەولوودی ئەو ساڵانەش، بە دەسبڵاوییەکی زۆرەوە شەکرا ورەحەتە لوقم و گوڵاویان بە سەر مێوانەکاندا دەبەخشییەوە. ئەم مەولوودە وەکو ساڵنامە وابوو، دەبوایە لە کاتی خۆی بکرابایە، ئیتر هۆکارێکیش بوو بۆ ئەوەی خزم و دۆستان بە یەکتر شادبنەوە.

لەو مەولوودانەش دەبوایە مام قازی بەشدار بوایە. سەرەرای ئەوەی کە لە کۆتایی ساڵانی حەفتا، پشتی بە تەواوی چەمابووەوە، بەڵام هەر بە پێ رێگای دەگرتە بەر و بە تەنها ئەو رێیەی دەبڕی. بۆ ئەو جۆرە حەجێک بوو، بەڵکو لە حەجیشی پێ خۆشتر بوو. دەیوت "ئەمە ریازەیەکی بەدەنی و رۆحییە، خودا لە جیاتی حەج بۆم دەنووسێ". کە دەگەیشتە نێوەی رێ، گۆچانەکەی دادەنا و قۆڵی کەواو سەڵتەکەی لێهەڵدەکرد و گرێیەکی لە فەقێیانەکەی دەدا و دەزنوێژێکی بە ئاوە ساردەکەی خاسە دەشۆرد و رووی دەکردە پردی شەهیدان و دوو رکات نوێژی بۆ غائیب دادەبەست. ئەگەر بکەوتایەتە دەمەو عەسەر ئەوە نوێژی عەسریشی دەکرد. لە سەرخۆ و بە ئاشکرا، ئایەتەکانی دەخوێندەوە و لەهجەی دەشتی شوان بە جوان و ئاشکراش لە کاتی خوێندنەوە ئایەتەکان دەردکەوتن. دەیوت "وەلازالین. ئامیین". بازووەکانی وەکو بازووی پیغەمبەران دەکردەوە و سکاڵاو دوعاکانی وەکو رەوە فریشتە، بۆ پیاوی ئاینپەرەوەکان دەبینران چۆن بەرەو عەرشی یەزدان بەرز دەبنەوە. کاتێکیش لە نوێژ دەبووەوە ، هەندێ گوڵە

کێویلەی، هەر بۆ نموونە، گوڵە حاجیلەیەکی لێدەکردەوە و بە دەرزیلەیەکیش لە سەر سەڵتە شینە نیلییەکەی گیری دەکرد. عەسرانێکی درەنگیش دەگەیشتە ماڵی باجی گورجی، پێشوەخت، لە دەرەوە، لە پشت دیوارەکە و بەرامبەر بە زێویە کورسییەکیان بۆ دادەنا و و قەدەرێک، بە تەنها لەوێ دادەنیشت.

من بەهار کەرکووکم جێهێشت. دوا مەولوودەکەی باجی گورجی و ژنهێنانەکەی ئامەد لە هەمان کاتدا روویان دا، هەر هەمان هەینیان بۆ مەولوودەکە و بۆ ژنگواستنەوەکەی تەرخانکرد. ئامەد، سەرباز بوو لە حیللە، بۆ چەند رۆژێک بە پشوو دەگەڕێتەوە و بە بێ ئەوەی پێشتر چاوی بە کچەکە بکەوێت، شەو دەچنە باخەڵی یەکەوە. کچێکی گەڕەکی ئاخور حوسێن بوو. لە راستیشدا، ئەوەی دەکرد ژن بە ژن بوو، کوردان زۆر حەز لە ئاڵوگۆڕە دەکەن، بۆیە کەسوکاری ئامەد هەموو شتەکانیان بڕاندبووە و ئەویش دەیزانی هەر مەسلەحەتی ئەویشیان دەوێت. بۆیە لەم ژن بە ژنە، کەس دوو دڵ نەبوو، بەڵام ژنهێنان و مەولوود بخرێنە رۆژێکەوە، هەندێ لچی خوارکردەوە و هەندێ نارەزایی لێکەوتەوە. "*شەرع رێنادا و چۆن شتی وا دەکرێت؟*" *چۆن ساڵیادی شەهید و ژنگواستەوە بە یەکەوە دانوولەیان دەکوڵێت*". زانا و نەزان، فەتوای خۆیان دا. دوو بەرە دروست بوو و کێشەکەیان گەیاندە لای مەلا عەبدوڵای رەحیمئاوا و پاشان چوونە لای مەلا سەمەدی دووگردیی، بۆ ئەوەی وەڵام بۆ ناڕەزییەکان بدۆزرێتەوە. خزم و کەسە ناڕازییەکانی مامە حەمە تەنها دڵیان بە مەلا سەمەدی دووگردیی ئاوی دەخواردەوە و خزمە ناڕازییەکانی باجی گورجیش بە مەلا عەبدوڵای رەحیمئاوا. هەردووک وتوبیان لە رووی شەرعەوە بە جێیە و مەلا سەمەد وتبووی" *لە نص چشتێکی وامان نییە ئەمە حەرام کات. ئێمەش شافعین.*" تەنانەت مەڵا عەبدوڵا وتبووی "*ئەم دوو ئاهەنگە وەکو دوو حەوضی نوورن و دەڕژێنە ناو یەکەوە*". مام قازیش لەم کێشەیەدا، هەڵبەتە قسەی هەبوو و کردی "*شەهید گوڵێکە لە میحرابی ژیان و ژنهێنانیش بەرەکتییە و هەردووکیش بەرگی یەک کتێبن*". کاتێک دەمەقاڵێش زیادی کردبوو و مام قازی وتبووی" *ئەگەریش بە دڵی من دەکەن، جلوبەرگی بووکەکە با رەش بێت و شەدەیەکی سووریش وەکو تاجە گوڵ*

بخرێتە *سەری*". شەرع شتێکە و دڵی ئەهلی رەحیمئاواش شتێکی دی. سەرەرای هەموو ئەرێیەکان، دوای بگرە و بەردەیەکیش زۆریش، مەولوودەکەیان هەفتەیەک پێشخست.

کەواتە بەم پێشخستنە هەموو رێککەوتن: حەوشەیماڵیان ئاوەڕشێنکرد، بە خاکەناسێکەوە بەربوونە بەر زبڵدانەکەی پشت ماڵەکە و بێڵتەپیان کرد و پاشان ئاوەڕشێنکرا، ریزە گڵۆپیان لە مزگەوتی ئیخوان بەکرێ گرت، مەنجەڵە زلە مسینەکەی ماڵی عەتییەیان هێنا و بە دوو زەلام هەڵیانگرتبوو. وردە وردە کەرەسەکان تەیار دەبوون و ئێوارەی رۆژی مەولوودیش نزیکبووەتەوە. هەر بۆ ئێوارەکەشی، لە سەربان، لاوەکان، بە یادوەری باوباپیران، بە پووش و چیلکەی رۆخی خاسە، ئاگریان کردەوە و سروودی نیشتیمانیان دەوت. سروود لە قەراغەکانی شاری کەرکووک؛ هەر بۆ خۆ دەوترا.

کاتێک مام قازی گەیشتە بەر دەرگای ماڵی باجی گورجی، زۆر تکایان لێکرد کە بچێتە ژوورەوە، بەڵام نەیویست و دەیوت *"دەچمە پشتماڵ و کورسییەکەم لەوێ بۆ دانێن"*. کورسییەکەیان بۆی برد و مام قازی لە سەرخۆ، لە سەری دانیشت و هەندەی نەبرد بە گۆچانەکەشی ئیشارەتی بۆ زێویە دەکرد و دەیویست شتێک بۆ کوڕەزاکەی شەرح کات کە لە تەنیشتییەوە راوەستابوو و سەیری دەکرد.

– ئەو خانووە سپییە دەبینیت، کامەران؟ پێش ئەوەی بە یەکجاری قادرزەمە جێبهێڵم و کاتێک بهاتمایە شار، دەچوومە ماڵ کوێخا ساڵح. خوا عافووی کات، پیاوێکی بە رەحم و دەسبڵاوبوو.

پێی دەچوو، کامەران گوێی بۆ باپیرەی شل نەکردبێت، منداڵێک بوو جار ناجارێک فێی دەگرت و شڵپەی دەهات و بەردەبووەوە. دوای بیست ساڵ، ئینجا زانیم کە بە هۆی پەرکەمەکەیەوە گیانی بە خاکسپارد. رۆژێکیان بە بێ ئەوەی کەس چاوی لێبێت، لەسەر دەم دەکەوێتە ناو چڵکاوێکەوە و دەمرێت.

سەیری باپیرەی کرد و پێی وت:

– کوێخا ساڵح برادەرت بوو؟

به بێ ئەوەی گوێ لە وەڵام بگرێت، تێی تەقاند و چووە ناو منداڵومەزن. ئەوەی قازی مەبەستی بوو باسی کات، جێی گرینگی پێدانی کامەران نەبوو...

وەک بڵێی قازی شۆڕبووبێتەوە نێو ساڵانی پەنجا و شەستەکان. ساڵانی لە ناوبردنی پاشایەتی و زەمانی حەرەس قەومی و ئینقیلانی شەست و هەشت هتد. لە نێو ئەو بیرکردنەوە و داڵغانە بوو و سەیر زێویەشی دەکرد، سەیری زەرعاتەکەی مامە حەمەی دەکرد و دەمێکیش بە نووکی گۆچانەکەی لە سەر خۆڵە کزرەکەی بەردەمی، هەندێ هێڵی کێشا و سڕییەوە. پێی دەچوو بیر لە شتێکی قووڵ بکاتەوە. بەس نەدەزانرا بیر لە چی دەکاتەوە.

وردە وردە مێوان دەهاتن و لەملاو ئەولای قازی دادەنیشتن. لە پشت دیوارەکە نیمچە بازنەیەکیان دروست کرد. سەربانیش پڕی لە منداڵوتواڵ و کچ و کوڕ و هەندێجاریش کچۆڵەی خەپان و ژنی تازەشووکردووشی تێکەوت. لە حەوشەکەش، باجی گورجی، وەکو جاران، بەڵکو زیاتریش، گورج و گۆڵ دەهات و دەچوو. بە دەستێک بەرانپیلەکەی گرتبوو و بە دەستێکیش جگەرەکە لە لا لێوی بەرنەدەبووەوە و فرمانی دەدا و هەندێجاریش جوێنی تفتی دەدا. دەیویست ئێوارەیەکی رێکوپێک بێت و کەس بە لچ خواری و بە دەمتاڵی نەگەڕابێتەوە ماڵ. لە نێو دڵخۆشیی ژنهێنانی هەینی ئایندە و ئەم یادوەرییە، هەندێجار تورەش دەبوو.

ئامەدی سەرباز، تەنها بە نامە ئاگادار کرابووەوە. لە نامەیەکی دوو لاپەڕەیی خورشیدیی کە مەلا سەمەد نووسیبووی باسی ئەو ژنهێنانەی بۆ کرابوو و هەر دووراودووریش مارەی بڕا بوو. باسی بووک لە نامەکەدا کرابوو: کچێکی باڵا مامناوەندیی گەنمرەنگە، کەمێ گۆشتن و سالارو ئیشکەرە، لە سەر هەمووشییەوە، کچێکی حەڵاڵزادەیە. ئاماد لە سەر دۆشەکە عەسکەرییەکەی پاڵکەوتبوو و نامەکەی چەند جارێک خوێندبووەوە و بۆ دواجار گرتبوویە دەست و نێوان رستەکانی دەخوێندەوە. واتە داڵغەیەک گرتبووی، تەواو لە شوورا و تەڵبەندەکانی ئوردوگا دووری کردبووەوە. دڵی زۆر خۆش بوو، وەکو زۆربەی کورگەلی ئەو زەمانە، عەسکەری تەواو کات و ئیشێک بدۆزێتەوە و خواش کچە

حەڵاڵیکی بە نیسب کات. نە خۆی وەڵامی دایەوە و نە ماڵەوەش چاوەڕوانی وەڵام بوون. مەلا سەمەد هەند بە مەزبووتی نامەکەی هۆنیبووە و بۆ کویرێکیش بخوێندرایەتەوە، هەموو دیمەنەکانی دەهاتە پێشچاو. بۆیە هەفتەیەک زیاتر بوو دەستیان بە تەیار دانی ئەم ژنگواستنەوەیە کردبوو. کەواتە بۆ هەفتەی ئاینده، نە مەنجەڵی شەربەت دەگەڕێننەوە، نە ریزە گلۆپەکانی مزگەوتی ئیخوان...

بەرەو مەولوودەکەش، وردە وردە میوانەکان دەهاتن و بە زۆربوونی میوانیش جۆش و خرۆشی مەلوود پەرەی دەستاند. لە خزمو کەس و ناسیاو و دەرو دراوسێ، تەنها ئامەدی سەرباز و عوسە دیار نەبوو، برا گچکەکەی ئامەد. ئەو بەو رۆژگارە لە دەم خاسە، لە گەڵ برادەرەکانی خەریکی راوە ماسی و ریشۆڵەگرتن و فیسقە گرتن و دووپشک لە کوون دەرهێنان و بزنمژۆک ماڵی کردن و هتد بوو. تەنها بۆ نانخواردن بە ماڵ دەکەوت، هەندێجار بۆ نانخواردنیش نەدەهاتەوە، بە نان و تەماتە و کالیاری زەرعاتەکە دەژیا.

سەرەرای ئەوەی مام قازی نغرۆی خەیاڵات و بیرکردنەوەکانی بوو، چاوێکێشی لە هەڵسووڕاندنی مەولوودەکە بوو و هەستی کرد عوسە دیار نییە، بۆیە دەمی ئاراستەی کچە زایەکی کرد بە پێش دەمییا تێپەڕی:

– ئەرێ هۆ خونچە، ئەوە دەڵێی عوسە لێرە نییە؟

لە دوو لاوە وەڵام درایەوە. بۆیە باجی گورجی ئەحەی بە شوێنیا نارد و وتی:

– لە بن دونیاش بێت، دەبێ هەر ئێستا ئەو قەحپەبابەم بۆ بهێننە ئێرە؟

ئەحە وەکو گزگل، لە پێشچاو ون بوو.

بۆنی دوکەڵ لە حەوشەکەوە بەرز دەبووەوە. دەنگی بەرز و سافەکەی حەسەن زیرەکیش لە تەسجیلە خراپەکەی بەر هەیوانەکەوە بەرز دەبووەوە. ئەو گرووپە بچووکەی حەوشەکەی دەخستە هەڵپەڕینەوە. چەند کیژۆڵەیەک بوون، دەستی یەکتریان گرتبوو و چۆپییەکی نەرمیش، مەمکە تازە پێگەیشتووەکانی دەخستە گۆرانییەوە. سەرەرای مەولوودەکەی پشتدیوار، لە حەوشەکە گیانی هەڵپەڕکێ ئەوانەی ئەوێی دەخستە لەنجەوە و لە دەرەوەش، پیاوان وەکو جاران بە دەنگی نزم قسەیان دەکرد. دەنگی حەسەن زیرەک، بە سووکی ئاودیوی

پشتدیوارەکە دەبوو و هەر جارە و دەنگەکە کەمۆیەک لە زیاتر بەرزببوایەوە، پیاوەکان سەیری یەکتریان دەکرد و هەندێکیش بە چرپە لە بنگوێی ئەوەی تەنیشتی، بە جوولانەوە دەستەکانی لەوە تێدەگەیشتین کە دەڵێت *"بابە عەیبە، مەلوود و ئەم بەزمەیان نەوتووە!"*

منداڵ و مەزنەکانی سەرخانووش، هەر کە چاویان بە شاییەکەی ناوحەوشە کەوت، ئەوانیش بۆ لاسایی کردنەوە دەستی یەکتریان گرت و گۆرانییەکەی حەسەن زیرەکیان دەوتەوە. جارناجارێکیش دەستی یەکتریان بەر دەدا و دەگەڕانەوە بۆ ئەوەی لە سەربانەوە، سەریان بۆ لای مەولوودەکە شۆڕکەنەوە و لە پڕێکدا یەکێکیان دەیدایە تریقە و هەموو دەکشانەوە. مام قازیش بە تیلی چاو سەیری دەکردن و پاشان سەیری جەماعەتی کرد و ویستی ئەنجەتی ئەم حریکەحریکانە بۆ دانیشتوان باس کات:

– مناڵن. دڵیان خۆشە.

کابرایەک کە هەر دوو کورسی لە مام قازییەوە دوور بوو، دەمی لە گوێی ئەوەی تەنیشتن نزیکردەوە و پێی وت:

– خوا هەڵناگرێ... ئەمە زۆر گوناهە! بابە گوناحە نا عەیبە!

مام قازی خێرا لەم فیسکە فیسکە تێگەیشت و بۆیە دەمی کردەوە جەماعەت و بە نەرم و هێمنییەکەوە پێیانی وت:

– سبەینێ ئامەد بە ئیجازە لە حیللە دێتەوە، خوشک و هاوسێیەکانیشی دەیانەوێت زەمینە بۆ ژنهێنانەکەی خۆش کەن. ئیمرۆ مەولوودە و لە سبەینێشەوە شایی بۆ ئەو موناسەبەتە دەست پێدەکات. ژنهێنان و ویلادەت، (ویستی ئاماژە بۆ مەولوود کات)، یەک شتن.

ئەمەی وت و بیری لە عوبێدی شەهید کردەوە. ئەو جوانە مەرگەی کە لە لای هەموو خێزانەکە بە زیندوویی ماوەتەوە. زۆر منداڵ بوو، هێشتا کاتی شەهیدبوونیشی نەهاتبوو. لە هەمان کاتیشدا، بیری لە ئامەد دەکردەوە، چۆن لە ئوردوگاکانی باشوور، بێگاریی پێدەکەن و چۆن ئێستا تامەزرۆی گەڕانەوە دەکات.

وەکو تەقلید، دوای نوێژی شێوان، مەولوودخوێن و مەولوودنامە بەرگشێنەکەشی لە ژێر هەنگڵ، قیت قیت وەکو موستەعیدانی زەمانی زوو و دوو لاویش، لەملاوئەولایەوە دەڕۆیشتن. یەکێکیان لایتێکی بەدەستەوە بوو تا لە قۆرت و چڵکاو و تەنەکەی فڕێدراو خۆیان بپارێزن؛ ئەوی تریش، سەری شۆڕکردبووە و هەنگاوی دەنا. تەزبیحاتی بە پەنجەکانی دەکرد، کە لە پشتییەوە شۆڕی کردبووەوە. بە پیاوە ماقوڵەکانی مزگەوت دەچوو، بەڵام ئەمیان هێشتا مووی دەرنەکردبوو. کاتێک مەلوودخوێن نزیک دەبێتەوە و سڵاو دەکات. پێشتریش، ئەسکەمبیلێکی بەتاڵ، لە ناوەند بۆ مەولوودخوێنەکە دانرابوو، بە هەستێکی خۆڕسکەوە، دوای فەرموو فەرموو، لە شوێنە بەتاڵەکە نزیکبووەوە و دەستی بۆ دوو لاوەکەش درێژکرد و بۆ ئەوەی هەر بە غار بچن، سەرو ئەسکەمبیلیش بۆ ئەوان بهێنن. هەموو لەبەری هەڵدەستن و دوای بەخێرهاتن، بێدەنگییەکی کاتیی، مۆسیقاکەی حەوشەی گەشاندەوە. گوڵاوپژێنەکە هات و گوڵاوی پرژاندە دەستی مێوانە نوێیەکان و وەکو غولامەکانی سوڵتان، بە ئاسپایی، گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی.

لە سەر سینییەکی فافۆن، سێ پەرداخ شەکراوی تەزیویان هێنا.

لە سەر سینگ، پیاوان هەڵسانەوە سەر پێ و بەخێرهاتنێکی تایبەتیان کرد. بێدەنگییەکی تر. مەولوودخوێنەکە دەستی بۆ باخەڵی درێژکردو دەفتەرە شینەکەی دەرهێنا و هەر کە شینەدەفتەر بینرا، سڵاواتێک بەرزبووەوە.

لە حەوشەکەش شایی گەرم بوو. یەک دوو مێردمناڵیش چووبوونە نێو کیژۆڵەکان و دەستیانیان گرتبوەو و پێکەوە هەڵدەپەڕین. بۆنی شەکرا و گوڵاویش بەرز دەبووەوە.

بە بیسمیلا دەستی پیکرد. پێش ئەوەی بگاتە ستایشکردنی فەخری کائینات، پێشەکییەی درێژ لە ئادەمەوە پێیا هات تاگەیشتە خاتەمولمورسەلین. دەیان وێنە و بەلاغەتی ئەندێشەئامێز باسی دروستبوونی کەون و ئەستیرەکان و زەمینی دەکرد. جۆرە هۆنینەوەیەکی خەیاڵئامێز بوو، هەندێکی لە سەرچاوە ئاینییەکانەوە

وەرگیرابوو و هەندێکی تریشی خەیاڵی دانەرەکەی ئەو ئاووهەوا سیحرئامێزەی دورستکردبوو.

بەڵام ئەم مەولوودە، لە هەموو مەلوودەکانی پێشی خۆی جیاوازتر بوو، چونکە لە گەڵ دروستبوونی جەو و ئەتمۆسفێری مەولوود، لە حەوشەکەش ئاهەنگی شایی و هەڵپەرکێ دەستی پێدەکرد. هەندێجاریش دەنگەکان تێکەڵ دەبوون، بۆیە مام قازی یەکێکی دەنارد بۆ تەمێکردن. بەڵام کاریگەریی تەمێیەکان زۆر کەمخایەن بوون و هەراو هوریا دەستی پێدەکردەوە.

مەولوود حەکایەتێک بوو. وەکو هەموو حەکایەتێکی دیکە درامای تایبەتی خۆی هەبوو، بۆ جۆشدانی ئەم خوێندنەوەیەش، بۆ دەف ژەنین، دوو دەروێشیان بانگ کردبوو. ئەو بخوورانەی کە لە دیوارەکانیش چەقێندرابوون، خەریک دەبوون تەواو بن و هیتریان دەهێنا و لە شوێنەکەی ئەوان دەیانچقاندنەوە.

جەوێکی ئەفسووناوی دروست ببوو. ئەستێرەکانی ئەو ئەنگوستەچاوە درەوشاوەتر خۆیان نیشان دەدا، بۆنی بخوور و گوڵاو و شەکراو ئاوێتەی یەکتر دەبوون. دەروێشەکان حاڵیان گرتبوو، چەند کەشیدەلەسەرێکیش هۆن هۆن دەگریان و جاحێڵەکانیش، جار نەجارێ ئاهێکی ساردیان دەکێشا، نە دەزانرا لە ترسی ئاگری جەهەننەم بوو یا لە حەسرەتی دووریان بوو لە مەحبووبەکانیان. لە نێو ئەم جەوە تایبەتەی خڕی خاسە بوو، عوسە خۆی کردە نێو جەماعەتا و مارێکی درێژیشی بە دەستەوە بوو. بە بینینی مارەکە، هەموو جەماعەتی تووشی ئەبڵەقبوون کرد. یەک دوو زەلامیش، بە تیلی چاو سەیری دەروێشەکانیان دەکرد، ئەوەیان بە بیر دەهێنایەنەوە کە *"ڕۆژ ڕۆژی ئێوەیە، فەرموون دەستی لێدەن"*.

هەموو سەیری عوسەیان کرد و عوسەش لە ژێر ڕۆشنایی لۆکسە هەڵواسراوەکە، زەردەخەنەیەکی کرد، ددانە زەرد و ناڕێک و گڕەکانی عوسە دەردەخەن. تەنها نەبوو. لە گەڵ دوو برادەری دیکەی هاتبوو، ئەوان کەمێک لە دوای عوسەوە وەستابوون. ئەوانیش سەرو قوتووی نەستەلەیان پێبوو؛ جارنەجارێک سەریان هەڵدەدایەوە سەیرێکی ناو قوتووەکەیان دەکرد و تەماشای جەماعەتە دانیشتوو و ئەبڵەقەکەیان دەکرد و ئەوانیش لە گەڵ عوسەدا پێدەکەنین.

سێ کوچکەی غەریب: مەلوود و شاییەکەی حەوشە و مار و دوپشکەکانی عوسە. مام قازی بە توڕییەوە هەڵسایە سەر پێ و بێدەنگییەک. دەفەکان راوەستان و مەلوودخوێن هەڵوێستەیەکی کرد و دوکەڵی بخووەرەکانیش بە هێمنی تێکەڵی رەشایی شەو دەبوون. بێدەنگیی پشتدیوارەکە، گەرموگوڕی ناوحەوشەکەی هەندەی دیکەی ئاشکرا کرد. شریتێکیان خستبووە سەر تەسجیلەکە و تریقەی پێکەنین و حریکە حریکە تێکەڵ بە دەنگی کەریم خەمزەیی دەبوو. مام قازی بە توڕەییەوە سەیری عوسەی دەکرد. زەردەخەنەهەڕاشەکەی وەکو گوڵێک ژاکا و روخسارێکی تایبەت لە ژێر رۆشنایی لۆکسەکە خۆی ئاشکرا کرد. مام قازی کەڵەگەت و بە ویقار و هەیبەت، ئاماژەی بۆ هەڕەشەیەکی بەڵگەنەویست دەکرد و پەیامەکەش بە ئاشکرا گەیشتە عوسە. دەنگی تەسجیلەکەش راوەستا. ئەوانەی سەربان ئاوا بوون. ئەستێرەکانی ئاسمانیش دەجریوانەوە.

لە نێو ئەم بێدەنگییە سەرسامە، عوسەو هەردوو برادەرەکەی خۆیان ئاودیوی تاریکە ئەنگوستەچاوەکەی خاسەکردەوە. کاتێک باجی گورجیش بەمەی زانیبوو، بەردێکی گەورەی هەڵگرتبوو و دوایان کەوتبوو و تاکو هێزیشی تیابوو، بەردەکەی بۆ هەڵدابوون. ئەوانیش گەڕابوونەوە هێلانە وکوولانەکەی خۆیان کە بە جۆرە ئەشکەوتێکی خەیاڵی دەکرد!

دوای ئەو رووداوە ناجۆرە، هەر وا بە ئاسانی باردۆخ و ئەتمۆسفێری مەولوودەکە نەدەهاتەوە سەرباری جارانی. تەبیعەتی مام قازی شێوا، هەندێ کۆکی و لە باغەڵی دەسەسڕێکی چوارگۆشەی گەورەی خەتخەتی دەرهێنا و بەڵغەمێکی خەستی فڕێدایە ژێر دیوارەکە و دەمی پێ سڕییەوە و قورگی پاککردەوە و جارێکی تر دەمولووتی پێ سڕییەوە و دەسەسڕەکەی گەڕاندەوە باغەڵی.

هەردوو دەفلێدەرەکە بە لەرینەوەی دەفەکانیان، زریزەکانیان هێنایەوە ورشە، حەوشەکە بە تەواوی هێمن ببووەوە و پەنجەی شایەتمانی لە نێو دەفتەرەکە دەرهێناو دەست بە خوێندنەوە کرایەوە. حەکایەت و بەسەرهاتەکان بەرەو کۆتایی

دەچوون و هەندێ گەنج و لاو کە پێشتر گوێیان بۆ مەولوود رایەڵ کردبوو، هەستان و شوێنەکانیان بە بەتاڵی مایەوە و بایان دایەوە و لە دەرگا تەنەکەوە چوونەوە حەوشە فراوانەکە. کوڕگەل وکچگەلی ناو حەوشەکە دۆش دامابوو و وردە وردە لە یەکتر نزیک دەبوونەوە و بە بزە بە یەکتریان دەوت " *با بیکەینەوە بەزم*".

که مەولوود تەواوببوو، رەشبەڵەک لەودیو گەرم داهاتبوو و مەلوودخوێن و ئەو دوو لاوەی کە لە گەڵی هاتبوون، بە خۆیان و لایتیانەوە گەڕانەوە. لە پشت دیوارەکە، مامە حەمە و مام قازی و دوو پیرەمێردی هاوسێ، دانیشتبوون، ئەگینا کەسی دیکە نەمابوو، زۆربەی زۆری مێوانەکان خۆیی بوون و لە حەوشەکە کردبویانە شایی. بە تێپەڕین کات، پشتدیوارەکە لە بێژنگ دەدرا و ئەو چوار پێنج کەسەی کە مابوونەوە و کەوتنەوە باسوخواسی ئاسایی خۆیان. پرسیارێک ئاراستەی مامە حەمە کرا:

– ئەرێ مامە حەمە، کاروباری زەرعاتەکەت چۆنە؟ خۆ ریشۆڵەت زۆر نەبوو ئیمساڵ؟

وەک بڵێی مامە حەمە بیری لە شتی دیکە بکاتەوە و وتی:

– کورە زەرعاتم بە قوڕگرت، توخوا ئەمە ئەتوارە کە عوسە هەیەتی. بەم شەوە موبارەکە خۆی کردە عاجباتی.

یەک دوو دەنگ لە ناو جەماعەتەوە بەرز بووەوە و بۆ ئەوەی مامە حەمە هێور کەنەوە:

– سەڵاوات لێدە برام، سەڵاوات.

پیرەمێردێک ئەم رستەیەی دەقاودەق وەرگرت و دەستی بردە ژێر گوێی تا هێزی تێدا بوو سەڵاواتی لێدا. ئەوانی دی، لە ژێر لێوەوە بۆیان سەندەوە.

مەلوود کۆتایی هات و شایی وهەڵپەرکێ دەستی پێکرد. دەروێش و وشکە سۆفیان لە شیرینی خەوی خۆیان بوون.

منیش بەو قرچەی هاوینە، لەو چەند خانووانە نزیک دەبوومەوە کە هێشتا ناویان بۆ نەدۆزیبووەوە. گردە و تەپۆلکە چەگلەکانم جێهێشتبوو و هەتاو

چاوقایمانە، لە ناو جەرگەی ئاسمان و هەموو سێبەرەکانی بە قەپاڵێک قووت دابوو. ئەمە چلەی هاوینی پێ دەڵێن لەم دەڤەرە. تووشی پیرەژنێک هاتم فۆتەیەکی سپی ئاڵاندبووە سەروملی و بە سەر گۆچانێکیشدا کوڕ ببووەوە. ئەو جۆرە سیمایانە، لە دوورەوە هەند پێکدەکەن، بۆیە بە دایک و داپیرە و هاوسێی خۆتی تێدەگەیت. کاتێکیش لێی نزیکبوومەوە، سڵاوێکم لێکرد و هەر بە بێدەنگیی و دەستە لەزرۆکەکانی بەرزکردەوە و لە ژێر چاوێلکە ئەستوورەکانیشییەوە، چاوە کزەکانی پێدەکەنین. ئەویش لە لایەکی ترەوە هاتبوو و بەرەو ئەو کۆمەڵە خانووانە دەڕۆیشت. پێی دەچوو ماوەیەکیش بێت بە ڕێوە بێت، تۆز و خۆڵێکی زۆر دامەنی کراس و کەواکەی غەرق کردبوو.

گەرما و هاڵاو ئەو ناوەی کردبووە دۆزەخێکی ناوادە. گەیشتمە بەر دەرگای ماڵ باجی گورجی. ئەو شەوەم هاتەوە یاد. دەرگا تەنەکەکە لە سەر پشت بوو، دوو پەلە پیتکەم لە دەرگاکە داو، چوومە ژوورەوە. حەوشە چۆڵ و هەیوانەکە چۆل و ژوورەکانیش چۆڵوهۆڵ. زوو لەوە تێگەیشتم کە دەمێکە لەم ماڵە نە ئاگر کراوەتەوە، نە ئاو بەو بەلووعەیەدا چۆڕەی کردەوە لە تەنیشت دەرگا قایم کرابوو. سەیرێکی دەرگا و دیوارەکانم کرد و گەڕامەوە.

بێهودەش، بەرەو زەرعاتەکە هەنگاوم نا. زۆر دوور نەبوو لە ماڵەوە. بە تەنیشت جەوەکاندا تێپەریم. کەوەر و کەرەویز و تەڕەتوورەکان هیشک ببوونەوە. جۆگەلەکان بێ ئاو و لە ناو هەندێکیشیان، چڵکاو دروست ببوون و دڵیان دەشێواند. وەختبوو بڕشێمەوە. خاکەناسێکم بینی کەوتبوو، تەنەکەیەک دانرابوو و سەفتەیەک رۆژنامەی لەسەر بوو. ئەمە عەرشە کاتییەکەی مامە حەمە بوو! کیسە نایلۆن و بووکە شووشەی فڕێدراو و چاکەتێکی سەوزباوی دڕاو وفانیلەیەکی سپی زەرد هەڵگەڕاو و دوو شووشە فەریدە و سەرە شووشەیەکی قەراغ زەردیش، بە سپیش لەسەری نووسرابوو "عرق مسیح". باڕ و مەیخانەکانی حەدیقەی ئوممەم بە خەیاڵا هات...

به فیرۆم زانی پرسیاری ئەوە لای خۆم دروست کەم و لە خۆم بپرسم "ئایا ماڵی باجی گورجی لێرەن یا نەء؟" ئەم هەموو شتە بێکەڵکانە و ئەم هەموو خەراباتە چیم پێ ناڵێن؟ ئەمە بابەتەکانی رۆژنامەکانی ئیمرۆن.

بەڵام بە فرسەتیشم زانی سەرێک لە ئەشکەوتە بە ناوبانگەکەی عوسە بدەم. من بە چاوی خۆم ئەو ئەشکەوتەم نەبینیبوو. بەڵام زۆرم لە بارەیەوە بیستبوو. پێش ئەوەی کەرکووکیش جێبهێڵم، دوو جاران بەو نیازە سەرم لە ماڵی باجی گورجی داو و وتم بەشکم عوسە دەبینم و ئەشکەتەکەیم پێ نیشان دەدا. رێکنەکەوت. بۆ هەردوو جارەکە عوسە لە ماڵ نەبوو و نەمویست، لە گەڵ باجی گورجی بچمە نێو باسی ئەم ئەشکەوتەوە، چونکە بێگومانم جنێوێکی مزرشی پێ دەدام. چونکە ئەتوارەکانی عوسەی هەند لە لا سەیر بوو، هەر کێیەک باسیشی بکردبایە، ئەوە تورە دەبوو.

وەکو باس دەکرا، ئەو ئەشکەوتە لە دەسکردی عوسە و هەردوو برادەرەکەی بوو. وەکو باخچەیەکی سەرەتایی ئاژەڵانی دروستکرابوو. چەندەها خشۆکی تێدابوو: مار و بزنمژۆک و دوو کیسەڵ و سێ قومقومۆک و هتد. بۆ مارەکان جۆرە قەفەزێکییان دروستکردبوو و سەرەتا قاڵبە چەمەنتۆیەکیان داڕشتبوو و پاشان چینی خۆڵ و بە تێل و سیمیش دەوریان دابوو و دەرگایەکی بچووکیشی هەبوو بۆ ئەوەی ریشۆڵە و جرجی راوکراوی بدەنێ. دووپشکەکانیشیان لە قوتوو دانابوو و کوللە و زیندەوەری بچووکیان بۆ راو دەکردن.

رۆژێکییان، هەر بە رێکەوت تێبینی ئەوە دەکەن کە بزنمژۆکەکە هەموو لەشی دەئاوسێ. بە جۆرێک ئاوسابوو کە توانای هەناسەدانیشی نەمابوو. هەندەی نەبرد، دوای دوو سێ رۆژ گیانی لە دەستدا. ئەو کات نەدەزانرا هۆکاری ئەم ئاوسانە چییە. بەڵام لەو ماوەیەدا حکوومەت بۆ مەبەستی تۆوکردن، جۆرە گەنمێکی سووری بە سەر جوتیاراندا دەبەخشێتەوە. ئەم گەنمە سوورە ژەهراوی بوو، بۆ ئەوەی لە لایەن زیندەوەرانی دیکەوە نەخورێت و هیچ رێنوماییەکی گونجاو و پێویستیش ئاراستەی جوتیاران نەکرابوو. هەندێ لەو جوتیارانە، هەندێ لەو گەنمە دەکوڵێنن و دەیکەنە ساوەر. هەر بۆ پێکەنین، هەندێک وتبویان " ئەمە

ساوەرە تەماتەشی ناوێت، هەر خۆی لە ئەسڵەوە سوورە" ئەوانەی ئەم ساوەرە دەخۆن، هەندە نابات دەبێت بگەیێنرێننە نزیکترین نەخۆشخانە و لە راستی دا ساوەری ژەهراوییان خواردبوو.

هەر هەمان گەنمیش لە لایەن ریشۆڵە و چۆلەکە و باڵداری دیکەوە خورابوو و مردارەوە ببوون. هۆکاری ئاوسان و مردنی بزنمژۆکەکەی عوسەش هەڵبەتە ریشۆڵەی مردارەوەبوویان دابوویێ. ئەم حەقیقەتە نە عوسە پێی دەزانی نە هەردوو برادەرەکەی.

ئەو باخچەیە بۆ عوسە لە بەهەشتی پانوبەرین بەهادارتر بوو. زۆر بە وردییەوە قەفەزەکانی دانابوو و لە سەر هەر قەفەزێکیش ژمارە و مێژووی راوکردنی ئاژەڵەکانی لەسەر پارچە مەقەبایەک نووسیبوو. ئەمە رۆژنامەی عوسە بوو. چونکە قەد لە وەرزی زاوزێکردندا راوی نەدەکردن. عوسە لەو بارەیەوە، ئامادە بوو دەرز بە مامۆستای زیندەورناسیش بدات. هەند لە ئاژەڵەوە نزیکبوو، یەک بە یەک لە خوو و عادات و هەڵسوکەوتیان شارەزا بوو. لە ماڵیش لە سەربان کۆتری بەخێو دەکرد. کۆترە تەقڵەبازەکانی لە یایچی و ترکەلانەوە بەرەڵا دەکرد و دەگەڕانەوە خڕی خاسە.

ئەم پەیوەندییە ئەفسووناوی بوو. هەندێ شەو هەر لە بەر دەرچەی ئەشکەوتەکە، بەتانییەکی دەدایە سەر خۆیاو و بە چەندین رۆژ نەدەگەڕایەوە ماڵ. شانازی بەوەوە دەکرد کە بۆتە سەرەک خێڵی ئەو ئاژەلانەی کە راوی کردوون. لە کارەکتەر و خووی ئاژەڵەکانی هەند تێگەیشتبوو و نیازیشی وابوو پەرە بەو ئەشکەوتە بدات و ئاژەڵی دیکەی بۆ راو بکات و یا ئەوەتە لە شوێنی دیکەوە بیانهێنێت. بیری لە کەمتیار و تانجی و پشیلەی کێوی و ژووژک کردبووەوە. بەڵکو بیری لە پەپوولەی سلێمانیش دەکردەوە کە لە گەڵ رەنگاڵە و تیترواسک و شوان هەڵخەڵەتێنە و هتد بکاتەوە و پەیدایان کات. زۆر قسەی لە گەڵ هەردوو برادەرەکەی لەم بارەوەیە کردبوو، بەلام پێی دەچوو ئەوان رازی نەبووبێتن، بە تایبەتی لەو قۆناغە هەستیارەی کە کەرکووکی پێدا تێدەپەڕی. بە تەنهاش گشت ئەم کارانە مەیسەر نە دەبوون.

هەمووومان ئەو شەوەمان دێتەوە یاد کە چۆن باجی گورجی عوسەی راونا؛ شەوێکی تایبەت بوو. دوو سێ شەو هەر پێی نەخستەوە ماڵ. دوو رۆژ پێش ژنگواستنەوەکە گەڕایەوە ماڵ. ئامەدیش لە حیللە گەڕابووەوە و هەموو مەشغوول بوون، کەس نەپرژایە سەر ئەوەی بزانێت عوسە لە کوێیە. بەڵام چێشتەنگاوێک، لە پشت داوەڵەکانەوە سێبەرێک پەیدا دەبێت و دایکی لێی نزیک دەبێتەوە و توند بە هەردوو چنگ یەخەی دەگرێت و بە هێز رایدەوەشێنێت و تا هێزیشی تێدا بوو شەقێکی ساوییە قنگی عوسە و چینێ جوێنی مزر، لە جوێنە تایبەتییەکانی باجی گورجی، ئا بەم شێوەیە دوا مەلەفی عوسە هەڵگیرا و ئاشتبوونەوەیەکی کاتیی هاتە گۆڕێ.

بەڵام ئەم دوو سێ شەوەی کە عوسە نایەتەوە ماڵ، بە نیسبەت ئەو جوانترین دیاریی بێت و پێشکەشی کرابێت. جگە لەوەی لە شووشتنی پیاڵە و پەرداخی شەکراو، لە گشت ئەو ئەتەکێتانەش خۆی دزیبیەوە کە لە بەخێرهاتن و ماڵئاوایی مێوانەکان بەرجەستە دەبوو. لە کاتێک مەولوودخوێن و دەفژەنەکان چووبوونە نێو حاڵ و جەویی خۆیانەوە، ئەم بە داروچیلکە و کۆتەرەدار کە ئاوی خاسە دەیهێنا و فڕێی دەدایە کەنارەکان، ئاگرێکی کردبووەوە. بە رۆژیش، بە دزییەوە، تا مامە حەمە و باجی گورجی نەیبینن، دەهاتە زەرعاتەکە و بە پێی پێویستی خۆی، تەماتە و پیاز و کالیاری لە گەڵ خۆی دەبرد. مەسینەیەکی نایلۆنیشی پڕ لە ئاوی خاسەکردبوو و لە تەنیشت ئەشکەتەکە دایِنابوو و تارەتی پێدەکرد. ئەو شەوە تا بەرەبەیان نەنووست، هەموو داخی دڵی بۆ مارە چاوڕەشەکە گێڕایەوە. دەیانوت هەردوو کەڵبەی بە گونییە هەڵکێشاوە، بەڵام ئەو سوێندی دەخوارد کە ئەمە ئەتواری دەروێشەکانی شێخ عەبدولکەریمە. دەیوت "*ئەوان درۆ دەکەن و دەروێش نین، خۆ منیش نە دەروێشم نە هیچ، بەڵام مار لە من تێدەگات!*" ئەوەشی دەوت کە مارەکە سەیدە و بە کەسەوە نادات. ئەوەشی دووپات کردبووەوە کە یەکێک لە مارەکان فێری قسە بووەوە لەهجەی خەڵکی شۆریجەشی هەیە.

هەندێجار دایک و باوکان وا دەزانن بە گەورەبوونی کوڕەکانیان، هەندێ خوو بە لاوە دەخەن، بەڵام عوسە زۆر جیاواز بوو و تا گەورەتر دەبوو خوو و

مەراقی بۆ ئاژەڵەکان زیاتر دەبوو. ئەمەش ببووەوە نارەحەتی بۆ باجی گورجی، چونکە دەیوت: *"تا منداڵ بوو، ئەم ئەژداد حیزە، دەموت قەنیاکە و مناڵە، بەڵام خۆ ئێستا زرتە زەلامێکە و دەبێ واز لەو ئەتوارە قۆڕەی بهێنێت و بگەڕێتەوە زەرعاتەکەی باوکی، خۆ بە چاوی خۆ دەبینێت کە ئامەد هێشتا زۆری ماوە بە یەکجاری بگەڕێتەوە ناومان. هەی وەهاووەها لێکراو"*. تا کار گەیشتە ئەوەی کە دایکی بچێتە لای یەکێک لە شێخەکان و نووشتەیەکی بۆ بکات و ئەویش ناچار بوو لە بەردەم دایک و باوکی بە ملیا هەڵیدەواسی و ئەگینا دەیکردە ملی مارە زەردەکە.

تەواو لەو چەند خانووە دوورکەوتبوومەوە و سەیری راست و چەپم دەکرد و ئاسەواری هیچ ئەشکەوتێکم لێوە دیار نەبوو. کیلۆمەترێک زیاتر رۆیشتبووم و گەرمایی نیوەڕۆ تینی زیاتر دەبوو و ئاوی خاسە هیشک و لە سەرابێکی تەنک کە ئاسۆی هێنابووە لەرزین، هیچ شتێکی ئەوتۆم لێدیار نەبوو. بە دەستە راستیش خانووە سپییەکانی زێوییەم لێوە دەردەکەوتن. لە سەر ستارەکان هێشتا هەندێ بالیفی رەنگاورەنگ شۆڕببوونەوە و هەندێ کوللەش هەڵنەگیرابوون.

خەون و پرۆژکانی عوسە سەریان نەگرت، چونکە یەکێک لە برادەرکانی ژن دەهێنێت و ئەوی تریشیان بە زۆرە ملێ ماڵیان بۆ هەولێر دەگوازرێتەوە. هەر کاتێکیش بە سەردان بگەڕایەتەوە کەرکووک، ئەوە هەر لە سەیتەرەکە بە شوفێرکەی دەگوت دابەزین هەیە و دادەبەزی و بە پێ بەرە ئەشکەوەتەکە شۆڕ دەبووەوە. ئەم حالەتە تا شەڕی ئێران و عێراق بەردەوام دەبێت.

کاتێک شەڕیش هەڵدەگیرسێ، سەلمان وەکو هەزارن بەچەی ئەو ناوچەیە، ناچنە عەسکەریی و دەکەونە ئەو کێوانە. نەبووە پێشمەرگە، چونکە بڕوای بە تەقەکردن نەبوو و دەیوت: *"ئەگەر تەقەم کردبایە، ئەوە دەچووم عەسکەرییەکەم دەکرد، من دۆستی ئاژەڵانم، چۆن تەقە لە ئینسان دەکەم"*. فیراربوونی ئەو ساڵانەش، دەیان جار لە عەسکەریکردن ناخۆشتر بوو. شەوێ لەم گوند و شەوێک لەو گوند، جگە لەوەی ژیانی فیراری بۆ ئەو زەمانە حسێبی شەرمەزاری بۆ دەکرا. عەیبە و شەرمەزاریی و ترسنۆک یەکێکن لە چەکە کوشندەکانی

بارودۆزخە تایبەتەکان. هەندێ بارودۆخ هەیە ئەگەر بێت فێرە تەقەکردن نەبیت، ژیانت لێ تاڵ دەکرێت. هەستی بە فشاری کۆمەڵایەتی دەکرد و هەستی دەکرد ئەوانەی سەیری دەکەن نیازیان زۆر پاک نییە. ئەم فشارانە وای لێکرد کە هەندە نەبات خۆی لە سەر سنووری ئێران و عێراق ببینێتەوە و خۆی تەسلیمی یەکەم بازگەی ئێرانی دەکات.

هەر بە پێ خۆی گەیاندە سەردەشت، پاشان لە گەڵ چەندین پەناهەندەی دیکە، بە هەلیکۆپتەر ناردیانە شاری سەقز و لەوێوە بۆ تاران. دوو هەفتە لە تاران و پاشان رەوانەی ئۆردوگا جەهەنەمییەکەی جەهروومی دەکەن. پارچە دۆزەخێک بوو لە دەشتاییەکانی شیراز. لە نێو ئەو گەرمایی و بیابانە هەموو یادگارییە شیعرییەکانی حافیز دەبوونە هەڵم. ئوردوگایەکی تەڵبەندکراو و تەنها یەک رۆژ لە هەفتەیەکدا، بواریان دەدایێ تا سەر لە شاری "جەهروم" بدات. ئێمە سۆراغی سەلمان تا ئێرە دەزانین، لەوە بە دواوە هیچ شتێکی باوڕپێکراومان لە لا نییە.

مێژووی ئەویش وەکو مێژووی هەزارانی دیکە بە دەڵێن و دەڵێن دەسپێدەکات و بە گوایە گوایە کۆتایی دێت. وتیان دەبێتە یان دەبێت بە سەربازی ئیسلامی و ژنە بەلووجێک دەهێنێت! دەڵێن چۆتە پاکستان، بە گوێرەی قیبلەنامە کوردییەکان، بەو نیازە چووە کە لە ئەورووپا نزیکبێتەوە! گوایە لە گەڵ دوو کوردی دیکە بە پێ گەیشتوونەتە چین و ماچین و بەمە رەقەمی قیاسیان لە کەیسەکانی پەناهەندێتی شکاندووە! ئەوەش وترا، لە قوتابخانەیەکی منالانی یەکێک لە گوندەکانی مازەندەران، بووەتە فەڕاش و لەبەر نەبوونی مامۆستا، دەرزیشی لە پاڵ فەڕاشییەکەی وتۆتەوە! وتیان لە بەر هەتاوی جەهرووم وەکو مۆم توایەوە! لە راستی دا کەس نەیزانی چی لێهات. بەڵام لە لای دایک و باوکی هەر زیندووە.

دایک و باوکە بەسزمانەکەی زۆر مەراقیان خوارد، زۆر هەوڵیان دا و زۆر ئەملاو ئەولایان کرد و دەستی ئەمەو ئەویان ماچ کرد و لەمەو لەو پاڕانەوە، بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆیان لە لا بەرجەستە نەبوو. باوکی کۆنە میرزا بوو و دەیوت: *"ئێمە سۆراغی تەواومان لەمەڕ شاعیرانی خۆمانەوە نییە، چۆن سۆڕاغی بەچەکانی خۆمانمان چنگ کەوێت! کوا کێ دەزانێت حاجی قادر کەی مردووە و*

*کەی لە دایک بووە، خۆ تۆ باسی ئەحمەدی خانی و فلان و فیسار مەکەوە کە لە سەدەکانی دیکە ژیاون".* تەنها یادگاریی بەرجەستە کە سەلمان بۆ ماڵەوەی جێهێشتبێت، رەسمێکی شەمسی قەد جنسییە عێراقییەکەی بوو؛ هەڵیانپچڕی و گەورەیان کردەوە و رتووشیان کرد و بە لاری، دوای ئەوەی لە چوارچێوەیەکی زێڕینی دەگرن، هەڵیانواسی.

وڕکێکی منداڵانە بوو و گەشەی کرد و بە نیازیش بوو ئەشکەوتەکە بکاتە شوێنێکی گشتی. بۆ نا، پەرەدان بە پرۆژەی وا بێگومان سەردەکەوێت. چونکە ئەم پرۆژەیە ئەنجانی خولیا و عەشق بووە. بۆیە لەم رووەوە هەوڵیدا ئەدرێسی دەسکەوێت، چونکە بیستبووی لە وڵاتانی ئەورووپا یارمەتی پرۆژەی لەمجۆرە دەدرێت و گرینگی پێ دەدرێت. بەڵام نەیدەزانی چۆن دەنگی خۆی بگەیەنێتە ئەوانەی پارێزگاریی لە ئاژەڵان دەکەن و مافی ئاژەڵان دەپارێزن. ئەوەی ئەو بیری لێکردەوە ئەوە بوو کە نامەیەک لە ژێر ناوێکی خوازراو بۆ ئێزگەی بەغدا، بەشی کوردی بنێرێت. نامەیەکی کورت و پڕ مانا. لە نامەکە داوای ئەدرێسی ئەو گرووپانەی کردبوو کە بە تەنگی ئاژەڵەوە دەچن. هەر بە پێ چووە پۆستخانە کە بەرامبەر بە چایەخانەی مەجیدییە بوو وپولێکی کڕی و فرێیدایە سنووقەکەوە. ئەمە یەکمجار و دواجاری بێت سەر لە پۆستەخانە بدات.

ئەم فیکرەیەی زۆر بە شێلگیریی و جیدییەوە وەرگرتبوو و دڵنیا بوو وەڵامێکی هەر دەدەنەوە. بۆیە هەموو سەر لە بەیانییەک، لە تەنیشت ئەشکەوتەکەو لەبەر سێبەرەکە، رادیۆ ترانزستەرەکەی لە گوێی نزیک دەکردەوە و گوێی رادەگرت. هەموو بەیانییەک، تا ئەو رۆژە هات کە ناوی ئەویان خۆێندەوە. گوێی لە ناوە خوازراوەکەی خۆی بوو و وەختبوو لە خۆشیا شاگەشکە بێت و دەستی بۆ دوگمەیە رادیۆیەکە برد بۆ ئەوەی دەنگەکەی سافتر کات. گوێی شل کردبوو و ئامادەکاری بەرمانەکە بە دەنگێکی ساف و بێگرێ، دەمی ئاراستەی "بەندە"ی خڕی خاسەکرد و پێی وت: *"هاوڵاتییەک نامەیەکی لە خڕی خاسەوە بۆ ناردووین و داوای ئەدرێسی ئەو کۆمەڵ و گرووپانەمان لێدەکات کە بە تەنگی ئاژەڵانەوە دێن. ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین با هاوڵاتی خۆشەویست کەمێک بە وردی و*

*ژیرییەوە سەیری ڕاست و چەپی خۆی بکات و بزانێت دەوەران لە چی دایە! برای هاوڵاتی دەڵێی ئەوەی لە بیرچۆتەوە کە نیشتیمانی ئازیزمان بە چ قۆناغێکی هەستیار و ناسکدا تێدەپەڕێت. ئەی بیر لە گشت ئەو هەڕەشانە ناکاتەوە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕوومان دێن. ئایا ئەوە نازانێت کە چارەنووسی وڵاتەکەمان لە زەلالەت دایە؟*" عوسە بە وردی گوێی بۆ گشت پیتەکان شل کردبوو، قەد لەوەو پێش عوسە بەو ئاستە تەرکیزی نەکردبوو. گوێی لە دوا ڕستە بوو " لە زەلالەت دایە" کە لە گوێی دەنگی دەدایەوە. زەلالەت... زەلالەت... زەلالەت...

دەماری گرژ دەبێت و هەندێک سەیری ڕادیۆکە دەکات و پاشان تاهێزی تێدا دەبێت تورِی دەدات و دەکەوێتە سەر گابەردێک و هەڕاش دەبێت. دەست دەکات بە گریان. ڕەنگە لە ژیانیدا قەد وا بە جۆشەوە نەگریا بێت، فرمێسک زەنگوڵ زەنگوڵ بە ڕوومەتیا دێتەخوارێ و دونیا لە پێشچاوی لێڵ دەکات. هەنسکی دەدا و وەکو قارەمانی داستانە تراژیدییەکان خۆی بە تەنها لە سەر گۆی زەوی دەبینێ. هەستیکرد بەرامبەر بە دەسەڵاتی گەردوون بە قە گەردێکی لێهاتووە، هەستیکرد هێرشێکی لەبنەهاتوو لە نادیارەوە بەرەو ڕووی دێت. هەر بە هەنسکەوە گەڕایەوە ئەشکەوتەکەی و یەک دوو ڕۆژ هەر دەرنەهات. هیچی نەخوارد و هیج نەخواردەوە. ئەو ڕۆژەی کە ئەشکەوتەکە جێدەهێڵێت و بەرەو زەرعاتەکە دەچیت، بێ تاقەت و ڕەنگزەردە. کاتێک دایکی دەیبینێت هەر واقی وڕ دەمینێ.

کەس بە تەواوی لە دونیای عوسە تێنەگەیشت. پەیوەندی ئەو لە گەڵ ئاژەڵان نە لە ڕێگای ڕۆشنبیرییەکی واوە بناغەی بەستبوو، نە جۆرە لاساییەکی هاوچەرخانەی شیکلئامێز بوو، نە لە ئەنجامی بەزەیی هاتنەوەش بوو بە ئاژەڵان و بە بەسزمانیان لە قەڵەم بدا. عوسە لەو ئەڵقە پچراوەی نێوان ئاژەڵ و ئینسانیش نەدەگەڕا. هەروەها بەدەریش بوو لە ڕامان و تەئومولاتی فەلسەفی. پەیوەندی ئەو بە کورتی سادەیی با و میهرەنای ئاوی هەبوو. جۆرە شیعرێکی ساوێلکەی پێویست بوو. عوسە لە ڕۆژگارێکی بەهاردا چاوی کردبووەوە، دایک و باوکی هەمیشە لە ناو شینایی و تەڕایی دەژیان، ئاوی خاسەش لە سەر ڕیتمی سروشت

خوڕەی دەهات و ئەویش حەکایەتی خۆی پێبوو. ئەو ئاقارە پڕی لە ریشۆڵە و پاساری و کوتری کێویی و کووکوختی و رەنگاڵە و کلک تەقێنە وبزنهەڵخەڵەتێنە و بزنمژۆک و کیسەڵ و بۆق و مار و دووپشک و سەگی بەرەڵا بوو. دوورتریش لوورەی چەقەڵ و گورگ و کەمتیار، هەندێجاریش رێوی چاوە زیتەکانی دەبینران. ئەمە لانکی دووەمی عوسە بوو.

ئەگەر ئێوارن، لە کۆشکلییەوە بڕوانیتە خاسە، کاتێک هەتاو ماندووە و بەرە و ئاوابوون خۆی ئامادە کردووە و ئەستێرەش وەک وردە زیخی تیشکهاوێژ، لە ئاسۆکانەوە هەڵدێن و ئاوێتەی قیڕەی بۆق قۆرباقە دەبن و دونیای ئێواران دەکەوێتەوە جریوە تا بەیانی. ئاسمانی ئەو قەراغ شارە، تەنها هەر بە لاپەڕەیەکی ئەفسانەیی رۆژهەڵاتی دێرین دەکات. هەندێجاریش مۆسیقایەکی بێدەنگیش، لە ئەتموسفێرە هەرە دوورەکانەوە لە دایک دەبێت و دەتسێتە پشتی سروشت و هێمنییەکی لە رادەبەدەریش دەخزێتە خەونەوە.

شەوانیش، جار ناجارێک ئەستێرەیەک دەکشێت و ئەفسانەیەک لە دایک دەبێت، کلکدارێک رەت دەبێت و نیازی بێوژنێک دێتە دی. کەرتە مانگێکی رەنگ ئاڵیش هەندێجار، بە نێو هەورە ریشاڵدارەکانەوە سەوڵ دەدات و تا بگاتەوە هەرێمی شینایی کە ئێستا رەنگێکی نیلی پەیدا کردووە. ئا لە شەوێکی وادا، مامانەکەی ناوکی عوسەی بڕیەوە و لە پەنجەرە شینەکەشەوە سەیری داوەڵەکانی کردووە و مانگیش لە پشتەوە، کوونەپەپوویەکیش خوێندوێتی و بۆ هاژەکانی ئاویش قیڕەی بۆق، تەلیسمی شەو تەونەکانی خۆی هۆنیوەتەوە.

هیچ بوارێک نەبوو بۆ هەڵبژاردن. بەدیلێکی دی بەدی نەدەکرا لە بۆ ژیان. بەراوردکردن لە ئاسۆی خەیاڵی عوسە وجوودی نەبوو و جێی نەدەبووەوە. بە پێویست، چمکەکانی ژیان و سروشت وکلتووری پێکەوە گرێ دەدا.

ئەو چێشتەنگاوەی کە رادیۆکەی تورِ هەڵدەدا و دەگەڕێتەوە ئەشکەوتە دەسکردەکەی، ئەمە تاقە وەڵامی ئەو بوو، وەڵامێک بوو بە بێرکردنەوە و حیسابات. هەر لە ئەنکیدۆ دەچوو. دەتوت پاڵەوانێکی دونیای کۆنە و دەداتە پڕمەی گریان. ئەرێ چۆن و بەچی گریانی پاڵەوانێک و ئینسانێکی ئاسایی

دەپێوریێت؟ ئەمجۆرە گریانانە ئینسان دەگەینێتە ترۆپکی تراژیدیا و لە هەمان کاتیشدا مرۆ دەگەیەنێتە ترۆپکی بەزین. هەر ئەمەیە واتاکانی تراژیدیا. دونیایەکی زیهنی خاپور دەبێت و تێکدەشکێت و بۆشاییەکی فراوان لە دایک دەبێت، تەنها هەر قین و تورەیی و دەمارگرژیی دەتوانن جێی خۆیانی تیا بکەنەوە. چەند بە ئاسانی دونیایەک دەروخێ و چەند بە زەحمەتیش دونیایەک لە دایک دەبێت. ئا ئەمە کێشە بنەرەتییەکی عوسە بوو. ئەگەر پشت لەم دونیابە بکات، ئایا دونیایەکی دی ئۆخژنی پێ دەبەخشێت؟

کێ بە تەواوی لە عوسە گەیشت؟ رەنگە تەنها مارە چاو رەشەکە لە عوسە گەیشتبێت، ئەو لە خورپەکانی دڵی و لە تیشکی چەماوەی چاوەکانی گەیشتبێت! هەموو دەزانین پەیوەندی نێوان مار و ئینسان زۆر کۆنە. ئەوان لە مرۆڤی روخاو وتێکشکاو دەگەن، هەر ئەوانیش بوون دەچوونە باغەڵی کیژە هەرزەکارەکانەوە و لەشە سارد و سرەکانیانیان گەرم دەکردەوە.

ئەڵقەیەکی سروشتی بوو پچڕا.

منیش تەواو لە شار دوورکەوتبوومەوە. زنجیرە گردەکان قووت ببوونەوە. بەڵام لە پەنای هێچ گا بەردێ، لە پەنای هیچ کەرتە شاخێک چاوم بە خەیاڵی ئەشکەوتێکیش نەکەوت. ئەوەی باس دەکرا زۆر لە رۆخی خاسەوە دوور نەبوو، ئاو بە بەردەمییا تێدەپەڕی و هەر سەرت هەڵبڕییایە دەتبینی.

بەڵام من هیچم نەبینی.

گەرامەوە بۆ ئەوەی جارێکی دی سڵاو لە قەڵا بکەم.

***

سەرکەوتنە قەڵا هەروا ئاسان نەبوو. نەمدەزانی ئایا هەر ئەو رۆژە بۆ عەسرەکەی برۆم، ئایا رۆژی دوایی. هەندە نابات خۆم دەگەینمەوە بازاڕاەکەی رەحیمئاواو ئیتر سواری تێمسێک دەبم و تا دەمباتە بن قەڵا. ئامانجی سەرەکی من ئەوە بوو بگەمەوە بەر دەرگا سەوزەکە و بەسەرهاتەکانی خۆمی بۆ

بگێڕمەوە. دەرگایەک بوو بەرەو ئیحتیمالاتی زۆر دەکرایەوە، ئەو ماڵە ڕۆژی یەکەم دالدەی داین و هەر ئەویش ڕەنگە توانای ئەوەی هەبێت و وەڵامی ئەوەم بداتەوە: ئەرێ ماڵی ئێمە بۆ کوێ باری کرد؟

ئەو دەتوانێت شەهادەتی ئەم زەمە وەریوەمان بۆ بدات. هیوام بە هیچ شتێک نەمابوو. خەونەکان پووک بوونەوە، شۆڕەسوارەکان گلان و وا لە هەڵدێرەکانن. ئەو ئاسۆیەی کە لە هەڵەتەکانیشەوە دەردەکەوت، تەڵخ و تاریک خۆی دەنواند. ئەو بستە زەمینەی کە جێی خەونی تیا دەبووەوە، هیشک و برینگ و بێمانان. ئەم گەڕانەوەیەم هەموو ئەندێشەکانی پووچ کردمەوە، زاکیرە چالاکەکانمی سڕییەوە.

دوای ئەوەندە ساڵە گەڕامەوە، بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی نوێ، پەیمانێکی نوێ لە گەڵ دار و دیوار و پەنجەرە و شۆستەکاندا چێ بکەم؛ بەڵام هێزێکی پتەوی لە رادەبەدەر بەرەو غوربەتییەکی تر رامدەپێچێت. لە ڕەگەوە هەڵمدەتەکێنێت و تورِ فڕێم دەدا... شوێنەکان خزن و کاتەکانیش وەکو چۆڕی لم لە نێو قامکەکانمەوە دادەڕژێن. تاقە چڵ کە بتوانم خۆمی پێوە هەڵواسم: زمانە. ئەویش هەندێجار تووشی کەندڕی وام دەکات، وشە و پیتەکان دەسووتێن. پێش ئەوەی دونیا ڕووناک بکەنەوە دەبنە سووتماک.

"قەلا کەپووی کلوونە، ژیلەمۆیەکی قووڵە" ئەم وێنە شیعرییەم لە ساڵی ١٩٨٦-١٩٨٧ نووسی، وێنەی لەو جۆرە، لەو ساڵانە هەموو جەستەمیان دادەگیرساند. مەبەستم ئەو کاتەیە کە لە شەقامی کارۆلین کۆشیعری "زەردک"م دەنووسی. لە دووڕرا، گەرمیی پێدەبەخشیم و ورووژانێکی پۆزەتیڤیشی پێدەبەخشیم و دەیهەژاندم و دەژیام. لەو شارەدا، رابردوو واتاکانی خۆی دەسگیر دەبوو. شاری کەرکووک و گەڕەکەکانی و کەسایەتی و ئاووهەواکەی تیاما دەبوژایەوە و هەر لەو شەقامە هەستم کرد من لە "زەردک" ژیاوم. یادوەرییەکان وەکو وێنەی شیعریی بوون تێکەڵ بە خەون دەبوون. ئەم هەموو کەرەسانە لە زمانێک دەگەڕان. سەرچاوەیەکی لەبننەهاتوو بوون بۆ ئافراندنی شیعریی.

هەر لەو ماوەیەشدا بوو، بە بێ ئەوەی ئاگام لێبێت، چڕنووکە ئاسنینەکانی بلدۆزەرکانی ڕژێم، خشتە زێڕینەکانی یەک بە سەر ئەویتردا دەڕوخاند.

دیوارەکانی بریندار دەکرد و دارودیواری لە گەڵ خاکدا کردە یەک. ئا لەو کاتانەدا، من خەونم دەبینی و ئەو گوندە بچووکە ئاوی دەزاندە وشەکانم و وێنە شیعرییەکانی ئاوەڕشێن دەکردم. شتەکان ڕەهەندی دیکەیان وەردەگرت و منیش لە دوورەوە، بە نەست، بە هەستی شەشەم دونیام دەخوێندەوە.

ئەو سەرلەبەیانییە هەر دەڕۆیشتم و نەدەگەیشتمە قەڵا. ڕێگاکان لەبەر پێم پەرتوبڵاودەبوونەوە و شۆستەکان تەسک دەبوونەوە و فەزا تووشی هەناسە سوارییی دەکرم. سەیری دیوارەکانم دەکرد و خشتێک نەبوو بمناسێتەوە، بەردێ نەبوو وەکو جاران سەیرم کات، پەنجەرەیەکم نەبینی کراوەبێت. ماوەکان شاش و چرکەکان خاو، زەمەن پەڕەی هەڵوەریوی خۆی دەنووسیەوە. ئەم گەڕانەوەیەم تەنها شکستێکی دیکەیەو هیچی تر. هەستم دەکرد دونیا روخاوە و هێزی ئەوەشم نەماوە هیوایەکی گێلۆکە بۆ خۆم دروست کەم. توانای ئەوەم نەبوو پێیە ئاڵۆزکاوەکانم بکەمەوە و تا هێزم تێدایە بەرەو نادیار و نە ناسراوەکان غار دەم.

ڕۆژ بە ڕۆژ هەستی ئەوەم تیا گەورە دەبوو کە شار تەنها پووشوپەڵاشە و بە بینینی من ئاگری تێبەر دەبێت. شار سەمەندەریش نییە تا لە نێو خۆڵەمێشی خۆی زیندوو بێتەوە. سەیری پێشەوەی خۆمم دەکرد و ئاساوارەکانی قەڵا لە ناو هاڵاودا بە تەڵخی دەردەکەوت. ئەو سەرلەبەیانییە هەر دەڕۆیشتم و نەدەگەیشتمە قەڵا، هەستم دەکرد قەڵا لێم دوور دەکەوێتەوە و نایەوێت بیگەمێ. ماندووبوونێکی نامۆ هەموو لەشمی دەهەنجاند و هەستم دەکرد فڕی دراومە بەر پێی خۆم و خۆم بێهێز و داهێزراو دەبینی.

داهێزراو وەکو ئەو ساتەی کە بۆ یەکەمجار چاومان کردەوە: ئێمە دوو جمکانە بووین و لە گوندی "تۆمار" چاومان کردەوە. گوێم لە گیانی ئەوی دیکە بوو و هەناسەی دەداو دڵە بچکۆڵانەکەی ترپە ترپی دەکرد و زیندووتر بوو لە من. ئەو چاوەڕوانی ژیانی لە من زیاتر لێدەکرا. بەڵام ئەو تەنها یەک دوو ڕۆژ ژیا و هەموو ئازارەکانی بۆ من جێهێشت. زۆر درەنگ زانیم کە جمکانە بووم، بەڵام ئەو ئەوەندەش نەژیا بۆ ئەوەی هەست بە ژیانی من بکات. من زانیم ئەو ناژێ، بەڵام ئەو ئەوەی نەزانی کە من دەژیم.

من هیچم له بارەی ئەوەوە نەنووسیوە، چونکە ژیانی شتێکی تۆمار نەکرد تا بنووسرێتەوە، بەڵام ئەم نووسینانە هی هەردوکمانە. هەستیش دەکەم چارەنووسی من بەشێکە لە ژیانی ئەو، هەر وەکو ئەوەی کە مردنی ئەویش بەشێکە لە مردنی من.

وەکو رۆژی یەکەم هەرەکەتم دەدایە خۆم. دەمویست پێیەکانم یەک لە دووی ئەویتر بەرەو پێشەوە بمبەن. لە هەمان کاتیشدا، زەمین بۆ خۆی کێشی دەکردم و نەیدەویست هەنگاوەکانم بەرەو پێشەوە بچن. وێنەکان وەک تارمایی لە پێشچاوم دەلەرینەوە و ماددییەتی خۆیانیان ون دەکرد و دەڕژانە حەوزەکانی نەبوونەوە. دونیا سپی هەڵدەگەڕاو سپییش نەبوو، جۆر شەفافییەتێکی بێکێش و بێبارستایی بوو. سەرەتا قورساییەکی بێئەندازەی پێبەخشیم و رۆژگار و تەمەنم وەکو قورقوشم کێشی زیاد دەکردن و بیناییان لێڵ دەکردم و هەستم دەکرد هەتاوی پێش نیوەڕۆش وەکو پەیکەرێکی لە مۆم دروستکراو دەمتوێنێتەوە. گەیشتبوومە دووڕییانی یەکبوون و جودابوونەوە، چرووسکانەوەیەک دەیهەژاندم و سەرەتا کەمێک کاس بووم و هەستمکرد لە دایکدەبمەوە و پاشان هەستم بە سووکییەکی رەها کرد.

بازووەکانم رادەوەشاند و بە جۆرێکی تامی لەشی خۆمم دەکرد. وەک بڵێی زاکیرە لەشێکی دی بوو مارەی دەکردم و دەچووە ژێر پێستەکەمەوە و دەچوومە ژێر پێستەکەیەوە. گەمەیەک لە نێوانمان لە دایکدەبوو سامناک وپێویست. هەستێک بوو کاتێک دیقەتی قامکە شاش و تەنکەکانم دەدا، وردە وردە پڕ ئێسقانەکانم پڕ دەبوون لە با. لەززەتێکی نوێ بوو حەوزی حەزێکی شەق دەکرد و ئاقارێکی بۆ پانتایی جەستەم دەدۆزییەوە. شتێک بوو سووک، دەیویست لە گەڵ خۆی بەرزم کاتەوە.

ئەمە حەزێکی کۆن بوو. مێژووی نەدەزانرا. نەشمدەزانی لە کەییەوە، لە چ خەونێکەوە، یا لە چ کارەسات و لیقەومانێکەوە چۆتە نێو شانە و مولوولەکانی خوێنمەوە. کەی بوو تۆوەکەی ترنجایە نێو لەشم و وا ئێستاش خەون بە درەختێکەوە دەبینێت. درەختێکە رەگەکانی وا لە ئاسۆن. بەڵام چ ئاسۆیەک؟

ئاسۆیەکی ناوەکی و شاقوولی، وەک شلەمەنی شیکل و شێوە دەگۆڕێت. حەزێکە وەک گڕ پاکیزەیە و وەکو ئاویش ڕێڕەوەکانی خۆی دەدۆزێتەوە. حەزێکە لە تەنیشت حەوزێ لە دایکدەبێت.

گوڕم دەدایە خۆم و پێیەکانم وەک بڵێی لە سەر پانتاییەکی شیدار بووبێتن، موچڕکێکی غەریبی پێ دەبەخشیم. سەیری ئاسمانم دەکرد. لە سەرەوە، قووڵ دەچووەوە، وەکو بزووتنەوەیەکیش ڕۆ دەچووە چاوە ڕەشەکانم. ئاسمان لە ناو چاو ئیسراحەتی دەکرد و خەونی بە بڵێسەوە دەبینی و بە زیندوویی تیاما شین دەچووەوە. بیرم لە هیچ نەدەکردەوە. هیچ. ئەمەش هەند ئازادی دەکردم کە لە وەسف بەدەر بوو. شوێن نرخ و بەهای خۆی ون دەکرد و فەزا بەرەو رووم دەهات و وەکو چارۆگەیەکی شەفاف کرایەوە.

نەمدەزنی ئەمە ڕۆژی یەکەمە یا دوا ڕۆژە. بەڵام شتێکی گرینگ رووی دا.

دەرگا ئاسنینە سەوزەکە کرایەوە. بۆ ماوەیەکی کەم، لە باوەشی زارۆکێک بووم. کۆڵانەکان جێی هەردووکمانی تیا نەدەبووەوە. ئەویش لە تەنیشت برا گەورەکەی، هەردووک دەیانویست، ئازادیم پێببەخشن.

لە ناو غەڵبەغەڵب و جوێن و هەراو زەنای منداڵانەوە بەرز بوومەوە. گڕ بووم بەرەو دەشتاییەکان فڕیم. بەرز بوومەوە و شار، لە خوارەوە تا دەهات بچووک دەبوومەوە و بێدەنگ و مەلوول، بۆنی گەرمایی دەهات و ئاسۆکان لە پێشم دەکرانەوە.

١٩٩٣ فەرەنسا

٢٠٠٠ ئیسپانیا

٢٠١١ ئیسپانیا